# جەژن و یاد و بۆنەکان

عەلی باپیر

## هەڵسەنگاندنێک



ئایینییەکان

جیهانیی وپیشەییەکان

نیشتمانیی و نەتەوەییەکان

نەورۆز



التفسیر

# جەژن و یاد و بۆنەکان

# و

# هەڵسەنگاندنێك

- ★ ئایینییەکان
- ★ جیهانیی و پیشەییەکان
- ★ نیشتیمانیی و نەتەوەییەکان
- ★ نـــــەورۆز



نـــــاوی کتێـــــب : جەژن و یاد و بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێک
نووســـــــینی : عـەلـی بـاپیــر
نەخشەســـــازیی : کۆمپیوتەری هیوا
خــــــــە ت : نەوزاد کۆیی
بــــــــەرگ : أمین مخلص
نـۆرە و سـاڵی چـاپ : یەکەم ١٤٣٤ک - ٢٠١٣ز
تـــــــــیراژ : ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپیاردنی ( ٢٩١٦ ) ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ٥ ﴾ إبراهيم.

**واتە:**

**وەبەدڵنیاییەوە مووسامان بە بەڵگەو نیشانەکانمانەوە نارد "فەرمانمان پێکرد" کە گەلەکەت لە تاریکییان بەرەو ڕووناکیی دەرباز بکەو ڕۆژەکانی خوایان یاد بخەوە، بێگومان لەوەدا بەڵگەو نیشانە هەن بۆ هەرکەسێکی زۆر خۆڕاگری زۆر سوپاس گوزار.**

## پێشکەش بێ

بەومسـولمانانەی کـە وێـڕای تونـد دەسـتگرتن بـە نەگۆڕەکانی شـەریعەتەوە، هـەولیش دەدەن بـەردەوام لـەبواری گۆڕاوەکاندا، ڕێبازو شێوازو ئـامڕازی تـازەو هاوچەرخانە دابێنن، تاکو خۆیانو دینەکـەیان لـەدنیاو ژین، بەجێ نەمێنن.

# پێشەکی

الْحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران،

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلامُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار [1]

ژیانی بەشەر بەگشتی بریتیە لەخۆشیی و ناخۆشیی و هەورازو نشێو، چ لەسەر ئاستی تاك تاكی مرۆڤەكان و، چ لەسەر ئاستی نەتەوەو هۆزو بنەماڵەو خێزانەكان و، ئەو كۆمەڵگایانەی كە بنیاتیان دەنێن و لەچوارچێوەیاندا دەژین. عادەتی مرۆڤیش وایە كە كەم و زۆر یادی ئەو پێشهات و ڕووداوانە دەكاتەوە،

[1] - ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەرێزی فێردەكرد پێش هەر قسەیەكی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

کە لەژیانی تایبەتیو گشتیدا هاتوونەتە پێشی، بەتاڵو شیرینیانەوە.
خوای کاربەجێش "سبحانه وتعالی" ئەو پێشهاتو ڕووداوە تاڵو شیرینانەی بە وشەی ڕۆژەکانی خوا (أيام الله) ناو بردوون، وەك لەوبارەوە فەرموویەتی:
﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٥﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: وە بەدڵنیاییەوە مووسامان بەنیشانەو بەڵگەکانمانەوە ڕەوانە کرد "فەرمانمان پێکرد" کە گەلەکەت لەتاریکییانەوە بەرەو ڕووناکیی دەرباز بکەو ڕۆژەکانی خوایان وەبیر بێنەوە، بێگومان لەوەدا نیشانەو بەڵگە هەن بۆ هەموو کەسێکی زۆر خۆڕاگری زۆر شوکرانە بژێر.
بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە مەبەست لەوشەی (أيام الله) لەئایەتەکەدا، ئەو پێشهاتو ڕووداوە خۆشو ناخۆشانەن، کە دێنە ڕێی مرۆڤ، ئەوەیە کە خوای زاناو شارەزا لەئایەتی دوای ئایەتی پێشوودا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ ﴾ إبراهيم، واتە: وە (یاد بکەوە) کاتێك مووسا بەگەلەکەی خۆی گوت: یادی چاکەی خوا بەسەرخۆتانەوە بکەنەوە، کە لەدەست دارو دەستەی فیرعەون قوتاری کردن، کە سوێغرەو بێگاریان پێدەکردن (و سزای خراپیان دەدان) وە کوڕەکانتانیان سەردەبڕیو ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە، وە لەوەدا لەپەروەردگارتانەوە چاکەیەکی مەزن هەبوو کە ببێتە مایەی تاقیکردنەوەتان.

کەواتە: ئەو ڕۆژانی خوا (أيام الله)یەی کە "خوا سبحانه وتعالى" فەرمانی بەمووسا "علیة السلام" کردوە، وەبیر گەلەکەیان بخاتەوە، ئەو ڕووداو و پێشهاتە تاڵ و شیرینانەن کە لەئایەتەکەی دواییدا ئاماژەیان پێکراوە، کە بریتیی بوون لە چەوسێنرانەوەو سۆغرەو بێگار پێکران و، نێرەوەز سەربڕان و مێینە هێشترانەوەیان و... هتد، وەپاشان دەربازبوون و ڕزگاربوونیان بەهۆی پێغەمبەرانی خوا: مووساو هاروونی برایەوە "سەلامی خوایان لێبێ" و ئازادو سەربەست بوونیان و، نیری ستەم و چەوساندنەوە لەسەر لاچوونیان.

شایانی باسیشە کە هەرکام لەوشەکانی:

١- جەژنەکان (الأعیاد) و ٢- بۆنەکان (المناسبات) و ٣- یادەکان (الذکریات)، وەك ناو و نیشانێکی گشتی بۆ ئەو ڕووداو و پێشهاتە خۆش و ناخۆش و شیرین و تاڵانە بەکاردێن، هەرچەندە هەندێك جار بەپێی عورف و باو، یەکێك لەوسێ وشانە "ڕەنگە غەیری وانیش" زیاتر بۆ جۆرێك لەو بۆنەو یادانە بەکاربهێنرێ، بۆ وێنە: وشەی جەژن (عید) کە تەنیا بۆ ڕۆژانی شادیی و خۆشیی بەکاردێ، "بەپێی عورف"، هەرچەندە لەبنەڕەتدا پێشهات و بۆنە خۆش و ناخۆشەکان،دە گرێتەوە، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە.

ئنجا خوا پشتیوان بێ هەوڵدەدەم لەدوو توێی ئەم کتێبەدا تیشك بخەمە سەر کۆی جەژن و بۆنەو یادەکان بەگشتی و، هەندێکیشیان کە مشت و مڕیان لەبارەوە کراوەو دەکرێ، وەك یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" و بۆنە ئیسلامییەکانی دیکەو، ڕۆژی نەورۆزو، بۆنە نەتەوەیی و نیشتیمانییەکانی دیکەو، یادو بۆنە جیهانییەکانی وەك: ڕۆژی دایك، منداڵ،

کرێکار، مافی مرۆڤ ...هتد، بەتایبەت.

ئامانجیشم ئەوەیە کە ڕێ نەدەین بەناهەق، بەناوی شەریعەتەوە بازنەی قەدەغەکراوەکان (المحرمات) لەسەر حیسابی حەلاڵو ڕەوا (الحلال والمباح) بەبێ بەلگەیەکی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەرعیی، فراوان بکرێ و، خەلکی تووشی سەغلەتیی (حرج) ببێ، چونکە خوای کاربەجێ و میهرەبان لەکتێبی بەهێزو بەپێزی خۆیدا، زۆر بەڕاشکاویی ڕایگەیاندوە، کە زۆری پێناخۆشە شتانێك کە بەڕەوای داناون، لەخەلکی قەدەغە بکرێن، وەك فەرموویەتی:

﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ .... ﴿٣٢﴾ ﴾ الأعراف، واتە: بلێ: کێ ئەو جوانیی و ڕۆزییە خۆشانەی کە خوا بۆ بەندەکانی وەدیهێناون، قەدەغەی کردوون..؟!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو شتە خۆش و بەسوودانەی خوا بۆی حەلاڵ کردوون، قەدەغە مەکەن، وە سنوورشکێنیی مەکەن، بێگومان خوا سنوور شکێنانی خۆشناوێن.

هەروەها لەبارەی دانەنانی سەغلەتیی لەئایین و بەرنامەکەیدا فەرموویەتی:

﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ ... ﴿٧٨﴾ ﴾ الحج، واتە: وە لەئاییندا هیچ جۆرە سەغلەتییەکی دانەناوە.

بەکورتیی:

بەم باس و لێکۆڵینەوەیەم دەمەوێ، بەرگریی لە فراوانیی و ئاسانیی و لەگەڵ فیتڕەتی ساغ و بەرژەوەندیی ڕاستەقینەی خەلکدا گونجاویی، شەریعەتی تێرو تەواویی خوای کاربەجێ بکەم، لەبەرانبەر هەندێك جۆرە تێگەیشتنی

سەرکێڵ و کرچ و کاڵدا، بۆ هەندێك ئایەت و دەقی سوننەت و بابەتی شەرعیی، کە سەرەنجام بەناهەق و ستەم، ڕووی گەش و جوانی شەریعەت دەشێوێنن و، بەبێ بەڵگەیەکی ڕاست و ڕوون، هەندێك شتی ڕەوا لەخەڵکی قەدەغە دەکەن و، لەئاکامدا یان سەغڵەت و بێزاریان دەکەن، یان "ئەگەر دامەزراو نەبن" لە ئیسلامیان دوور دەخەنەوەو دەیانتارێنن و دەیانتۆرێنن و، ڕاست بە پێچەوانەی فەرمایشتەکەی پێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم"، مامەڵەیان لەگەڵ دەکەن، کە فەرموویەتی: (يَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا، وبَشِّرُوا ولا تُنفِّرُوا) متفق عليه، واتە: (دینداریی) ئاسان بکەن و قورسی مەکەن، وە (خەڵك) دڵخۆش بکەن و بێزاریان مەکەن و مەیانسڵەمێننەوە.

هیواداریشم ئەم نووسینە ئەو ئامانجەی کە بۆی نووسراوە بیپێکێ و، خۆشحاڵیش دەبم بەتێبینیی و ڕەخنەو سەرنجی دڵسۆزانەو بابەتییانەی هەر خوشك و برایەك، چونکە بێگومان هەقی ڕەها (الحق المطلق) تەنیا لەلایەن خوای بەرزو مەزن و زاناو کاربەجێ و شارەزایە: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف، وەتەنیا پێغەمبەرانیش "صلى الله عليهم وسلم" لەهەڵەو کەم و کووڕیی پارێزراو (معصوم)ن.

**سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا اله الاّ أنت**

**أستغفرك واتوب اليك**

**٥ محرم/١٤٣٤ کۆچی**

**٢٠١٢/١١/١٩ زایینی**

**بەغدا**

# ڕێ خۆشکردن

**خوێنەری سەنگین !**

ئەم کتێبەی بەردەستت لە بنەڕەتدا چوار ئاڵقەی بەرنامەی (مەحەك)بوو، کە کاك سۆران عومەر لەگەڵ بەندەدا ئەنجامی دەدا، بەڵام دوایی لێم زیاد کردو دەستکارییم کردو لەشێوەی وتووێژو پرسیارو وەڵامەوە گۆڕیم بۆ ئەم حاڵەتەی ئێستای.

وەئەم کتێبە بۆ سێ بەش دابەش بووە:

**بەشی یەکەم:** دە (١٠) بنەمای گرنگ بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمی یادو بۆنەو جەژنەکان.

**بەشی دووەم:** لەبێژینگدانی بەڵگەکانی ئەوانەی سەرجەم یادو بۆنەکان بەحەڕام دەزانن.

**بەشی سێیەم:** لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی ڕەوایی و نا ڕەوایی یادکردنەوەی ڕۆژی نەورۆزەوە.

شایانی باسیشە کە هەوڵمداوە بەپێی توانا، ڕوون و کورت و گوشراوانە بابەتەکە بخەمەڕوو، هەربۆیەش لەشێوەی وتو وێژو چاوپێکەوتنەوە گۆڕیم بۆ شێوەی نووسین و، هەرچییەك پەیوەندیی بەخودی بابەتەکەوە نەبووبێ لامبردوە، بەڵام بێگومان کەم و زۆر شوێنەواری قسەی زارەکیی (شفهي) چاوپێکەوتنی هەرپێوە دیارە.

# بەشی یەكەم

# دە (١٠) بنەمای گرنگ بۆ ڕوونكردنەوەی حوكمی یادو بۆنەو جەژنەكان.

**خوێنەری بەڕێز!**

لەم بەشەدا دە (١٠) بنەمای گەورەو گرنگی شەریعەت دەخەینەڕوو، كە هەركەسێك بەوردیی سەرنجیان بداتو باش لێیان تێبگات، بەئاسانیی حوكمی شەرعیی یادكردنەوەی یادو بۆنەو جەژنەكانی بۆ ئاشكرا دەبێ.

ئەو بنەمایانەش ئەمانەن:

١- ئیسلام لەقورئانو سوننەتدا بەرجەستەیەو، قسەو بۆچوونی زانایان، تێگەیشتنی ئەوانە لەبارەی ئیسلامەوە، نەك خودی ئیسلام.

٢- ئاسانكاریی "لەسنووری شەریعەتدا" یەكێكە لە بنەماكانی شەریعەت.□

٣- ئیسلام حەزناكات بازنەی قەدەغەكراوەكان (محرمات) لەسەر حیسابی ڕەوا (مباح) فراوان بكرێ.□

٤- كردەوەكان بەگشتی بۆ هەردووك جۆری: خواپەرستییەكان (العبادات)و هەڵسو كەوتەكان (المعاملات - العادات) دابەش دەبن.□

٥- بناغە لەخوا پەرستییەكاندا قەدەغەبوون (حظر)و، لەهەڵسو كەوتەكاندا ڕەوا (مباح) بوونە.

٦- شتی ڕەوا بەهۆی بەهەڵە بەکارهێنرانییەوە، حوکمە ئەسڵییەکەی ناگۆڕێو قەدەغە نابێ.

٧- نیازو مەبەست، حوکمی هەڵسو کەوتەکان دەگۆڕێ.

٨- یادو بۆنەو جەژنەکان لەبازنەی هەڵسو کەوتو عادەتەکاندان.

٩- بیدعەت تایبەتە بەهەردووك بواری عەقیدەو عیبادەتەوە.

١٠- هەرکات حوکمێکی شەرعیی لەسەر بناغەی عورفو عادەتێك بنیات نرا، بەگۆڕانی عورفو عادەتەکە، ئەو حوکمەش دەگۆڕێ.

# بنەمای یەکەم:

# ئیسلام لەقورئان و سوننەتدا بەرجەستەیەو قسەو بۆچوونی زانایان ،تێگەیشتنی ئەوانە لەبارەی ئیسلامەوە، نەك خودی ئیسلام.

**بەڕێزان !**

هەرچەندە ئەم بنەمایە یەکێکە لە بەئاشکرا زانراوەکانی ئیسلام‌و، ناگونجێ هیچ کەس لام‌و جیمیی لەبارەیەوە هەبێ، بەڵام بەکردەوەو لەکاتی جێبەجێکردن (تطبیق)دا زۆرکەس پێیەوە پابەند نابێ‌و، دیارە پێوە پابەند نەبوونیشی مرۆڤ دووچاری گرفت‌و کێشەی زۆر دەکات، بگرە زۆر لەلادان (إنحراف)و بەلاڕێدا ڕۆیشتنی بەشێك لەمسوڵمانان، هۆکارەکەی پابەند نەبوونە بەم بنەما گەورەو گرنگ‌و ئاشکرایەوە!

بۆیە بەپێویسم زانی بۆ دەرخستنی حوکمی یادو بۆنەو جەژنەکان بەگشتی، بەر لەهەر شتێك ئەم بنەما شەرعییە گرنگە بخەمەوە بەرچاو.

بەڵگەش لەسەر ڕاستیی‌و تەواویی‌و ئاشکرایی ئەم بنەمایە، ئەوەیە کە جیاوازیی لە نێوان پێغەمبەران "عليهم الصلاة والسلام"و غەیری ئەواندا، ئەوەیە کە پێغەمبەران لەلایەن خواوە "تبارك وتعالى"، سرووش (وحي)یان بۆ هاتوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ...﴿١٦٣﴾ ﴾ النساء، واتە: ئێمە سرووشمان بۆتۆ کردوە، وەك چۆن سرووشمان بۆ نووح‌و پێغەمبەرانی دوای ویش کردوە...

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ...﴿١١٠﴾ ﴾ الكهف، واتە: "ئەی موحەممەد" بڵێ: بێگومان من تەنیا مرۆڤێکم وەك ئێوە، سرووشم بۆ دێ کە پەرستراو "ی بەهەق"تان یەك پەرستراوە "کە خوایە"...

ئنجا بێگومان پێغەمبەرانیش "عليهم الصلاة والسلام" لەبەرانبەر وەحی

خــوای زانــاو شــارەزادا، وەك هەرکەســێکی دیکــە، جگــە لەشــوێنکەوتنی و جێبــەجێکردنی، هــیچ مــافێکی دیکــەیان نــەبووە، وەك خــوا "عــز وجــل" بەپێغەمبەری کۆتایی "صـلی الله علیـه وسـلم" فـەرمووە: ﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾ یـونس، وەشـوێن ئـەو سرووشـە بکەوە کە بـۆت کـراوە، وەخۆڕاگربـە، هـەتا خـوا حـوکم دەکـاتو بڕیـار دەدات، وەئەو باشترین بڕیار دەرە.

ئاشکراشە کە سرووش (وحي)ێك کە بۆ پێغەمبەری خاتـەم (محمـد) هـاتوە، لـە قورئـانو سـوننەتدا کورت هـەڵاتوە، وێـڕای جیاوازییـەکانی نێـوان قورئـانو سوننەت، کە ئێرە شوێنی ئەو باسە نیە.

ئنجا بەڵگـەش لەسـەر کـورت هـەڵاتنی سـرووش (حصـر الـوحي) لـەقورئانو سوننـەتدا زۆرنو، بگرە ئەوە لەمەسەلە ڕوونو بەئاشکرا زانراوەکانی ئیسلامە، خوای کاربـەجێش فەرموویـەتی: ﴿ ...وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الـنحـل، واتـە: وەزیکرمـان بـۆلای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تـاکو ئـەوەی بۆلایـان نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وەبـەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

هــەروەها خــوای بــەرزو بــێ وێنــە فەرموویــەتی: ﴿ ...وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾ الحشــــر، واتە: وە هەرچی پێغەمبەر پێتان دەدا "لەئەرك و فەرمانەکان" لێـی وەربگـرن، وەئەوەی ڕێگرییان لـێ دەکات "لەقەدەغەکان" وازی لــێ بێـنن، وەپـارێز لـەخوا بکەن، بێگومان خوا سزای توندە.

ئاشکراشە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" ئاراستەمان دەکات لەفەرمان و ڕێگرییەکان (الأوامر والنواهي)، یان هەر لەخودی قورئاندان، یان بریتین لە فەرموودەو کردەوەو دانپێداهێنانەکان (الأقوال والأفعال والتقريرات)ی، کە وشەی سوننەت (السنة) کۆیان دەکاتەوە.

دیارە ڕستەی: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾یش پاش ڕستەی: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ ﴾ زۆر بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، کە سەرپێچیی کردنی مسوڵمانان، بۆ هەرچی کە پێغەمبەری خوا "صلی الله علیه وسلم" پێیان ڕادەگەیەنێ، لەدوو توێی قورئان و سوننەتدا، دووچاری سزاو جەزرەبەی توندو سەختی خوای دادگەرو باڵا دەستیان دەکات.

هەروەها پێغەمبەریش "صلی الله علیه وسلم" لەوبارەوە کە وەحی خوا (وحي الله) لەقورئان و سوننەتدا بەرجەستەیەو تێیاندا کورت هەڵاتوە، فەرموویەتی: (...أَلا إنِّي أُوتيتُ الكتاب و مثله معه..)، رواه أبو داود والترمذي: ٢٦٦٥، وابن ماجه: ١١٣، واتە: ئاگاداربن! من کتێبم پێدراوە "وەك وەحی"، وە وێڕای وی وێنەی ویشم پێدراوە، کە بێگومان مەبەستی پێ سوننەتە، بەهەرکەسێك جۆرەکەیەوە.

**بەڵێ بەڕێزان !**

ئیسلام لەسرووش (وحي)دا بەرجەستەیەو، سرووشیش لەقورئان و سوننەتدا بەرجەستەو کورت هەڵاتوو (محصور)ە، هەربۆیەش زانایانی ئیسلام لەسەر بنچینەیەك ڕێککەوتوون لەوبارەوە کە دەڵێ: قسەکانی زانایان بەڵگەیان لەسەر دەهێنرێتەوەو بە بەڵگە ناهێنرێنەوە (أقوال العلماء يستدلُّ لها ولا يُستَدلُّ بها).

ئنجا هەر لێرەشەوە بووە کە (ابن عباس) "خوا لێی ڕازی بێ" ڕۆژێك لە

کۆڕێکدا باسی مەسەلەیەکی کردو فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوای "صلی الله علیه وسلم" لەبارەوە هێنایەوە، یەکێکیش لەئامادەبووان لەوبارەوە باسی قسەیەکی ئەبوبەکرو عومەری کرد "خوا لێیان ڕازی بێ" (إبن عباس)یش تووڕەبوو و گوتی: (یوشِكُ أن تَنْزِلَ علیكم حجارة من السماء، أقول: قال رسول الله "صلی الله علیه وسلم"، وتقولون: قال: أبوبكر وعمر!)[1]

واتە: نیزیکە لەئاسمانەوە بەردتان بەسەردا ببارن، دەڵێم: پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" وایفەرمووە، ئێوەش دەڵێن: ئەبو بەکرو عومەر!!

کەواتە:

ئیسلامو شەریعەت تەنیا بریتیە لە قوڕئانو سوننەتو، جگە لەو دوانە بەخودی ئیسلامو شەریعەتەکەی دانانرێو، قسەو بیروڕاو ئیجتیهادی زانایانو مەزهەبەکانیان "جگە لەوەی ڕاستەوخۆ لەقوڕئانو سوننەت وەرگیراوە" تەنیا بەتێگەیشتنی ئەوان لەبارەی ئیسلامو شەریعەتەوە دادەنرێ، نەك بەخودی ئیسلامو شەریعەت، پێشم وایە ئیمام شافیعیش ڕەحمەتی خوای لێبێ، هەر

[1] - روى معناه أحمد ( ٣٣٧/١ ) والخطيب في الفقيه والمتفقه ( ص ١٤٤ ) وابن عبد البر في بيان العلم وفضله ( ص ٥٧٠ ) من طريق شريك عن الأعمش عن الفضيل بن عمرو قال : أراه عن سعيد بن جبير عن ابن عباس قال : تمتع النبي صلى الله عليه وسلم فقال عروة بن الزبير : نهى أبو بكر وعمر عن المتعة فقال ابن عباس ما يقول عروة ؟ قال : يقول : نهى أبو بكر وعمر عن المتعة ، فقال ابن عباس أراهم سيهلكون أقول قال النبي صلى الله عليه وسلم ويقول نهى أبو بكر وعمر . أ . هـ وفي سنده شريك من عبد الله القاضي وفيه ضعف يسير.
و للأثر سندٌ آخر رواه إسحاق بن رهويه في مسنده ( كما في المطالب العالية ) ٣٦٠/١ رقم ١٢١٤) ورواه ابن عبد البر في ( بيان العلم ) تعليقا ( ٥٧٠ (ورواه الخطيب في الفقيه ( ١٤٥/١ ) وأبو مسلم الكجي ( ذكره ابن القيم في الزاد ٢٠٦/٢ (من طريق أيوب عن ابن أبي مليكة عن عروة – به – قال الحافظ ابن حجر : سنده صحيح. وقد روى هذا الأثر معمر عن أيوب فأسقط ابن أبي مليكة ، لكنّ الصواب ذكر ابن أبي مليكه كذا ر واه حماد بن زيد عن أيوب . والله أعلم . وأما اللفظ المذكور: وهو يوشك أن تنزل عليكم حجارة من السماء ... فلم نجده ، لكن ذكره ابن القيم ولم يعزه لأحد كما في الزاد ١٩٥/٢ ، لە پێگەی: (منتديات شبكة السنة النبوية وعلومها)دا هاتوە، (http://www.alssunnah.net/vb/showthread.php?t=1207).

مەبەستی ئەوەبووە کە گوتوویەتی:

کل العلوم سوى القرآن مَشْغَلَةٌ وسوى الحديث والفقه فى الدين

العلم ماكان فيه: قال "حدثنا" سوى ذلك وسواس الشياطين

ئنجا شتێکی ئاشکراشە کە لەکاتێکدا بەهۆی نەشارەزایی لەقورئان و سوننەت و دەمارگیریی (تعصب)یەوە بۆ قسەو بیروڕاو مەزهبی زانایان، قسەو ڕاو ئیجتیهادییەکانیان وەك دەقی شەریعەت و دین مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، لەجیاتی ئیسلامێکی بەرجەستە لەقورئان و سوننەتدا، سەدان و بگرە هەزاران جۆرە ئیسلاممان لێ پەیدا دەبن !!

ئـەم بنەمایـەش چـەندان ئایـەتی قورئـان و دەقـی سـوننەت بـەڕوون و ڕاشكاویی و جەخت لەسەركردنەوە ڕایانگەیاندوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ ...يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقـرة، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و زەحمەت و قورسیی بۆتان ناوێ.

ئەم ڕستە موبارەكەش لەسیاقێكدا هاتوە، كە هەمووی باسی ڕۆژوو گرتنی مـانگی ڕەمـەزان دەكـات: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة.

كەواتە: لەسۆنگەی ئەوەوە كە بابای نـەخۆش و بابـای ڕێبـوار بـەهۆی ڕۆژوو گرتنەوە تووشی زەحمەت و ناڕەحەتیی دەبن، خوای میهرەبان مۆڵەتی داون كـە بـەڕۆژوو نـەبن و، لـەڕۆژانی دیكـەدا ئـەو ڕۆژانـە بگرنـەوە، چـونكە خـوای بەبەزەیی حەزناكات بەندەكانی تووشی ناڕەحەتیی و قورسیی ببن.

٢- ﴿ ...مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ المائـدة، واتە: خوا نایەوێ بـەهیچ جۆرێـك سـەغڵەتتان بكـات، بـەڵكو دەیـەوێ پاكتـان بكاتـەوەو چـاكەی خۆیتان لەسەر تەواو بكات، بەڵكو سوپاسگوزاریی بكەن.

ئەم ڕستە موبارەكەش كە بەشێكە لەئایەتێك، پاش ئەوە هاتوەو لەسیاقێكدا هاتوە، كە خوا باسی دەستنوێژو پاشان خۆشوردن و، دوایـیش لـەكاتی نـەبوونی ئـاودا تـەیـەمموم كردنـی كـردوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ

﴿... فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ ۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ۚ مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ ... ﴿٦﴾﴾ المائدة.

کەواتە:

لەو حاڵەتەدا کە ئاو چنگ ناکەوێ، یان ناگونجێ بەکار بهێنرێو بەکارهێنانی خاوەنەکەی تووشی زیان دەکات، خوای میهرەبان مۆڵەتی داوە کە لەجیاتی ئاو، بۆ هەرکام لەدەستنوێژو خۆشوردن (الوضؤ والغسل) تەیەمموم بکرێ.

٣-﴿ يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ۚ وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾﴾ النساء، واتە: خوا دەیەوێ لەسەرتان سووك بکات، وەمرۆڤ بێهێز دروستکراوە.

ئەم ئایەتە موبارەکەش کە خوای بەبەزەیی تێیدا ڕایگەیاندوە، کە ڕەچاوی بێهێزیی (ضعف)ی مرۆڤی کردوەو ئەرکی سەرشانی سووك کردوە، بەتایبەت لەبەرانبەر غەریزەی جینسییدا، چونکە ئەم ئایەتە لەسیاقێکدا هاتوە، کە هەمووی باسی مەسەلەی هاوسەرگیریی‌و تێرکردنی غەریزەی جینسییە بەشێوەیەکی شەرعییانە.

کەواتە: خوای کاربەجێ‌و بەخشندە لەو حاڵەتانەدا، کە زانیویەتی مرۆڤەکان تووشی سەغڵەتیی‌و بارگرانیی دەبن، ئەرکەکانی شانی سووك کردوون، تاکو دووچاری بێزاریی‌و گرفتاریی نەبن لەدینداریياندا.

هەروەها لەوبارەوە پێغەمبەری خواش "صلى الله عليه وسلم" فەرمایشتی

زۆرن، بۆ وێنە:

٤-(يَسِّرُوا ولا تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا ولا تُنفِّروا) متفق عليه، واتە: (دینداریی) ئاسان بکەن و وەزەحمەت مەخەن، وە (خەڵك) دڵخۆش بکەن و مەیانسڵەمێننەوەو بێزاریان مەکەن.

٥-پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" عادەتی هەمیشەیی وابووە کە لای ئاسانیی گرتوەو، هیچ کات بەلای زەحمەت و بارگرانییدا نەشکاوەتەوە، وەك دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ لەوەسفی پێغەمبەردا گوتوویەتی، کە بێگومان هاوسەریش لەهەمووکەس بەهاوسەری خۆی ئاشناترە:

(ما خُيِّرَ رسولُ الله "صلى الله عليه وسلم" بين أمرين قَطُّ الاّ أَخَذ أَيْسَرَهُما مالم يكن إثماً، فإن كان إثماً، كان أبعد الناس منه) متفق عليه، واتە: هەرگیز پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" لەنێوان دوو کاردا سەرپشك نەکراوە، مەگەر ئاسانەکەیانی وەرگرتوە، ئەگەر گوناه نەبووبێ، ئەگەر گوناه بووبێ، لەهەمووکەس لێی دوورتر بووە.

٦-(ما بالُ رجالٍ بلغهم عَنِّي أمرٌ تَرَخَّصْتُ فيه فكرهوه وتَنزَّهوا عنه، فوالله لأنا أعلمهم بالله وأشدهم له خشيةً) متفق عليه، واتە: بۆچی پیاوانێك لەمنەوە پێیان دەگات کە مۆڵەتم لەشتێکدا وەرگرتوە "لای ئاسانییم گرتوە" کەچی ئەوان پێیان ناخۆشەو خۆی لێ دوور دەگرن!! بەخوا من لەوان بەخوا زاناترم و زیاتریش لێی دەترسم.

دیارە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" بەتووڕەیی و بێزارییەوە باسی کەسانێك دەکات کە بەخەیاڵی خاوی خۆیان، لەبەر زێدە شارەزایی و پارێزکاریی و بۆخوا صوڵحان، هەندێك لەوشتانەی کە پێغەمبەری خوا "صلى

الله علیه وسلم" کاری بەمۆڵەت (رخصـة) کـردوە تێیانـدا، "بۆ وێنـە: بـەڕۆژوو نـەبوون لەسـەفەردا" ئـەوان کـارکردن بەمۆڵـەتیان "وەك پێغەمبـەری خـوا" پێخۆش نەبووەو کاریان پێنەکردوە!!

ئنجا دوایـی کـە پێغەمبـەری خـوا سـوێند دەخـوات، لەسـەر ئـەوە کـە لـەوان بەخوا زاناترەو، لەوانیش زیاتر لـێ‌ی دەترسـێ‌و پارێزی لـێ دەکات، مەبەسـتی ئەوەیە ئـەو بۆچـوونە لارو چـەوتەیان بـۆ ڕاسـت بکاتـەوە، کـە مـەرج نیـە، کـێ سەختگیریی (تشدُّد)ی زیاتر بکات، لەخوا ترسترو شارەزاترو بەدینتر بێ!

هەڵبەتە نە پێغەمبەری خوا "صلی الله علیـه وسلم" مەبەسـتی بـووەو، نـە ئێمــەش مەبەســتمانە، کــە حــەڕام بــۆ خــەڵکی حــەلاڵ بکــرێ‌و دەســتکاریی ســنوورەکانی شــەریعەت بکــرێ! نــەخێر، بــەڵام پێویســتە دڵنیــاش بــین کــە شــەریعەت هــەتا بلــوێ لای ئاســانیی دەگــرێ‌و، حــەزناکات خــەڵك ســەغڵەت‌و بارگران بکات.

پاشان وەك چۆن شلگیریی‌و بەزایەدان (تفـریط) نیشانەی کـەم پارێزکارییـە، بەهەمان شێوەش سەختگیریی‌و تێپەڕاندن (التشدُّد والإفراط)یـش هەرنیشـانەی کەم پارێزکارییەو بەڵگەی نەشارەزاییە، دینـداریی ڕێـك‌و ڕاسـتیش ئەوەیـە کـە ڕاستە شەقامی خوا بگرێ‌و، نە لـێ‌ی بەجێ بمێنیی‌و نە لـێ‌ی تێپەڕێنی.

# بنەمای سێیەم:
# ئیسلام حەزناکات بازنەی قەدەغەکراوەکان (مُحرَّمات) لەسەر حیسابی ڕەوا (مباح) فراوان بکات

ئەمیش چەندان ئایەتی قورئانی بەپێزو دەقی سوننەتی پێغەمبەری بەڕێز "صلى الله عليه وسلم" بەڕوون و ڕاشکاویی ڕاینگەیاندوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو شتە خۆش و سوودبەخشانەی خوا بۆی حەلاڵ کردوون، قەدەغەیان مەکەن وەسنوورشکێنیی مەکەن، بێگومان خوا سنوور بەزێنانی خۆشناوێن.

٢- ﴿ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ قَتَلُوا أَوْلَادَهُمْ سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾ الأنعام، واتە: بێگومان زیانبار بوون ئەوانەی نەفامانە، بەنەزانیی منداڵەکانی خۆیانیان کوشتن، وەئەو ڕۆزییەی کە خوا پێیداون، بەدرۆ هەڵبەستنەوە بەناوی خواوە قەدەغەیان کرد، زیانباربوون و ڕێی ڕاستیان نەگرتبوو.

٣-(إن الله تعالى فرض فرائض فلا تُضَيِّعوها، وحدَّ حدوداً فلا تعتدوها، ونهى عن أشياء فلا تنتهكوها، وسكت عن أشياء من غير نسيان لها رحمة لكم، فلا تبحثوا عنها) رواه الدار قطني والطبراني في الكبير برقم: (٥٨٩)، والبيهقي، واتە: خوای بەرز چەند ئەرکێکی پێویستکردوون، مەیانچوێنن، وەچەند سنوورێکی کێشاون، مەیانبەزێنن، وەچەند شتێکی قەدەغە کردوون، توخنیان مەکەون، وەلەڕووی بەزەیی پێدا هاتنەوەتانەوە بێ لەبیرچوونەوە، لەچەند شتێك بێدەنگ بووە، لێیان مەپرسن.

٤-(ما أحلّ الله في كتابه فهو حلال، وما حرّم فهو حرام، وما سكت عنه فهو عفو، فاقبلوا من الله العافية، فان الله لم يكن نسياً، ثم تلا هذه الآية: ﴿...وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾ مريم) رواه الحاكم وقال صحيح الإسناد، وقال البزّاز: الإسناد صالح، واتە: ئەوەی خوا لەکتێبی خۆیدا حەڵاڵی کردوە حەڵاڵەو، ئەوەی قەدەغەی کردوە قەدەغەیە، وەئەوەی لێی بێدەنگ بووە، ئەوە ڕەوایەو ئەوەی خوا ڕەوای کردوە لێی وەربگرن، چونکە بێگومان خوا هیچی لەیاد ناچێ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: "وەناگونجێ پەروەردگارت شتی لەیاد بچێ".

دیارە ئەو ئایەتو فەرمایشتانە کەتەنیا چەند نموونەیەکن، زۆر ڕوونو ئاشکران لەوبارەوە کە خوای کاربەجێو پێغەمبەرەکەی "صلى الله عليه وسلم" پێیان ناخۆشەو قەدەغەیان کردوە، کە بەهیچ بیانوو و پاساوێکەوە ئەو شتانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی لەقورئانو سوننەتدا حەڵاڵو ڕەوایان کردوون، قەدەغە بکرێن، چونکە بێگومان جگە لەخوای زاناو شارەزاو کاربەجێ، هیچ کەسی دیکە مافی ئەوەی نیە حەڵاڵو حەرام بۆ خەڵکی دیاریی بکات، وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾﴾ يونس، واتە: بڵێ: ئەو ڕۆزییە کە خوا بۆی ناردوونە خوار، وە هەرلەخۆوە بەحەرامو حەڵاڵتان داناوە، بڵێ: پێم بڵێن: ئایا خوا مۆڵەتی داون، یان بەناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن؟!

ئاشکراشە کە شەریعەتی خوای کاربەجێ، لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوای بەخشەر هەرچی لەبوونەوەردایە بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤەکانی وەدیهێناوە،

وەك فەرموویـــــــەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ...﴿٢٩﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: (خـوا) ئـەو كەسـەیە كـە هەرچـی لەزەویـدا هەیـە بـۆ ئێـوەی دروستكردوە..

هــەروەها فەرموویــەتی: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ... ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية، واتە: وەهەرچی لە ئاسمانەكان و لەزەویدایە، هەمووی لەلایەن خۆیەوە بۆ ئێوە ڕام و ملكەچ كردوە..

بەڵێ لەسۆنگەی ئەوەوە، كە ڕێژەی شتە حەڵاڵ و ڕەوایەكان، زۆر زۆر زیاترە لەهی قەدەغەكراوەكان، خوا قەدەغەكراوەكان دەستنیشان و دیاریی دەكات، تـاكو بزانرێ كە جگە لـەناو هێنـراو و دیارییكراوەكـان، هەرچی دەمێنێتـەوە، ڕەواو حەڵاڵە، وەك خـوای زانـاو توانـا فەرموویـەتی: ﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ... ﴿١١٩﴾ ﴾ الأنعام، واتە: وەئایا بۆچی لـە (گۆشـتی) ئـەو سـەربڕاوە نـاخۆن كـەناوی خـوای لەسـەر هێنــراوە، لەحاڵێكـدا كـە (خـوا) ئـەوەی بـۆ ڕوون كردوونەتــەوە كـە لــێی قەدەغەكردوون، جگە لەوەی كە بۆی ناچار دەبن بیخۆن..

ئەوەش كە لە گۆشتەكان (لحوم) قەدەغەیە چوار شتن، كـە خـوای كاربـەجێ لەچوار شوێن لەقورئاندا باسیكردوون، كە ئەمانەن:

١-﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ...﴿١٧٣﴾ ﴾ البقرة.

٢-﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ... ﴿٣﴾ ﴾ المائدة.

٣- ﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ... ﴿١٤٥﴾ ﴾ الأنعام.

٤- ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ... ﴿١١٥﴾ ﴾ النحل.

کەواتە: خواردنە قەدەغەکراوەکان لەقورئاندا، ئەم چوارەن:

١- مردار.

٢- خوێن.

٣- گۆشتی بەراز.

٤- سەربڕاو بۆ غەیری خوا.

بۆیەش خوای کاربەجێ ئاوا بەڕوونیی و لەچەند شوێنێك لەقورئاندا باسیکردوون، تاکو بزانرێ کە جگە لەوچوارە، هەموو جۆرە خواردنەکان حەڵاڵ و ڕەوان، واتە: لەسەر حاڵەتی بنەڕەتیی خۆیان کە ڕەوایی (إباحة)یە ماونەوە.

ئنجا وەك لەبنەمای پێنجەمیشدا دەیخەینەڕوو، زاناو پێشەوایان بنچینەی بناغە لەشتەکاندا ڕەواییە (الأصل في الأشياء الإباحة) یان لەو هەموو ئایەت و فەرمایشتانە وەرگرتوە کە ڕایانگەیاندوە: شتەکان بەگشتی ڕەواو حەڵاڵن، نابێ هیچ شتێك لەدروستکراوەکان و لەکردەوەو هەڵس و کەوتەکان بەقەدەغەو ناڕەوا دابنرێ، مەگەر بەڵگەیەکی ڕوون و بێ چەندوچوونی لەسەر هەبێ، چونکە خوای میهرەبان و کاربەجێ ڕایگەیاندوە، کە بەگشتی دروستکراوەکانی بۆ مرۆڤ وەدیهێناون کە لێیان بەهرەمەند ببێ.

# بنەمای چوارەم:
# کردەوەکان بەگشتی بۆ هەردووك جۆری:
# خواپەرستییەکان (العبادات)و هەڵس و کەوتەکان
# (المعاملات - العادات) دابەش دەبن

بەسەرنجدان و تێوەڕامانی کۆی ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" بەتەعبیرێکی فراوانتر: دەقەکانی سوننەت، چونکە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ واتە: فەرمایشتەکانی، وە کردەوەکانی، وە دانپێدانراوەکانی، بە سەرنجدانی کۆی ئەو دەقانەی شەریعەت، بۆمان دەردەکەوێت کە کردەوەکانی ئینسانەکان لە ڕوانگەی شەریعەتەوە، دەبنە دوو بەش و، بۆ دوو جۆر پۆلێن دەکرێن:

**جۆری یەکەم:** پێی دەگوترێ: پەرستشەکان (العِبادات)، کە بریتیە لەو کردەوانەی کە لە نێوان ئینسان و خوادا ئەنجام دەدرێن، یاخود ئینسان ئەنجامیان دەدات، بۆ ئەوەی پێیان لە خوا نێزیك بێتەوە.

**جۆری دووەم:** پێیان دەگوترێ: هەڵسوکەوتەکان (المعاملات)، یان پێیان دەگوترێ: نەریتەکان (العادات)، کە بریتین لەو کردەوانەی کە ئینسانەکان کە لە نێوان خۆیاندا ئەنجامیان دەدەن.

ئەمە بۆ هەر کەسێك کە تۆزێك شارەزای شەریعەت بێ و، تەماشای دەقەکانی قورئان و سوننەت بکات، بە ئاشکرا دیارە، وە پاشان هەرکەس تەماشاش بکات، دەبینێ کە ئینسان دوو جۆرە پەیوەندیی هەن:

١ـ پەیوەندییەك لەگەڵ خوادا سبحانه وتعالی وەك بەدیهێنەر، وەك پەروەردگار، وەك پەرستراو، وەك خاوەن.

**٢ـ وە پەیوەندییەك لەگەڵ مرۆڤەکاندا، وەك کەسانێك کە لەگەڵی لەسەر ئەم زەوییە دەژین.**

ئنجا ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ لە نێوانی خۆی و خوادا ئەنجامیان دەدات، پێیان دەگوترێ: (العبادات) کە کۆی (عبادة)ە و ئەمیش واتە: ملکەچبوون بۆ خوا، وە ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ لە نێوان خۆی و ئینسانەکاندا ئەنجامیان

دەدات، پێیان دەگوترێ: (المعاملات) هەڵس وکەوتەکان، یاخود نەریتەکان (العادات)، جا هەرچەندە وەك گوتم، ئەوە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام بەوەندە وازی لێناهێنین و، وەك نموونە چەند قسەیەکی زانایان لەوبارەوە دێنینەوە، چونکە ئێمە لەداهاتوودا زۆر پێویستییمان بەم ڕاستییە دەبێ:

١-(إبن رجب الحنبلي) لە کتێبی (جامع العلوم والحکم)دا[1] کە شەرحی (٥٠) فەرموودەی کردوە، دەڵێ: (والأعمالُ قسمانِ: عبادات ومعاملات) واتە: کردەوەکان دوو بەشن، خوا پەرستییەکان و هەڵسوکەوتەکان.

٢-(الشاطبي) کە ئەویش یەکێکە لە زانایانی بەرجەستەی ئیسلام، لەوبارەوە دەڵێ: (المطلُوب الشَّرعِي ضَرْبان: أَحَدهُمَا: مَا كَانَ مِن قبيل العادات الجَارِية بَيْنَ الخلق، من الإكتسابات وسائِر الْمحاولات الدنيوية، التي هي طرق الحظوظ العاجِلَة، كَالعقود على اختلافها، والتصاريف المالية على تَنَوُّعها، والثاني: مَا كَانَ من قبيل العبادات اللازمة للمكلف، من جهة توجهه إلى الواحد المعبود)[2] واتە: ئەوەی کە شەرع داوای کردوە، داواکاریی شەرعیی دوو جۆرە، یەکەمیان: بریتییە لە هەڵسوکەوتەکانی کە لە نێوانی خەڵکدا ڕوودەدەن، وەك: کاروکەسابەت و بازرگانیی و هەموو شێوە هەوڵدانەکانی دنیایی، کە بریتین لە ڕێبازەکانی وە دەست هێنانی مەبەستە دنیاییەکان، وەك گرێبەستەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە، وە هەڵسوکەوتە داراییەکان بە هەموو شێوەکانیانەوە، دووەمیان: بریتییە لەو خواپەرستییانەی کە لەسەر ئینسان پێویستن، لەو ڕووەوە کە ڕوو دەکاتە خوای تاکی پەرستراو.

---

[1] - ص١٣٩.

[2] - الموافقات في أصول الشريعة، ج٢، ص١٩٤.

٣-(إبن تيمية)ش لەکتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)دا دەڵێ: (أَنَّ تَصَرُّفَاتِ الْعِبَادِ مِنْ الأَقْوَالِ وَالأَفْعَالِ نَوْعَانِ: عِبَادَاتٌ يَصْلُحُ بِهَا دِينُهُمْ, وَعَادَاتٌ يَحْتَاجُونَ إِلَيْهَا فِي دُنْيَاهُمْ)[1] واتە: هەڵسوکەتی بەندەکان لە قسەکانو کردەوەکانیان، دوو جۆرن: چەند خواپەرستییەك کە دینداریيانی پێ چاك دەبێو بەڕێوە دەچێ، وە چەند عادەتو نەریتو هەڵسوکەوتێك کە بۆ ژیانی دنیایان پێویستییان پێیانە.

٤-(عزالدين عبدالعزيز بن عبدالسلام)یش کە بە (سُلطان العُلَمَاء) بە ناوبانگە، لە کتێبی (القواعد الكبرى الموسوم بـ{قواعد الأحكام في إصلاح الأنام}دا لەوبارەوە گوتوویەتی: (المَشْروعَات ضَرْبَان: أَحَدهُمَا مَا ظَهَرَ لَنَا أنهُ جَالِبٌ لِمَصْلَحَة أَو داريءٌ لِمَفْسَدَة، أَو جَالب داريء لِمَفْسَدة، أَو جَالب داريء لِمَصْلَحَة، ويُعَبَّرُ عَنْهُ بأنهُ مَعْقُول الْمَعْنَى. الضَرْبُ الثاني: مَا لَمْ يظهرْ لَنا جَلْبُهُ لِمَصْلَحَة أو درؤه لِمَفْسَدَة، وَيُعَبَّر عَنْهُ بِالتَعَبُّد. وَفِي التَعَبُّد مِن الطواعية والإِذْعَان مِمَّا لَمْ تعرف حكمتهُ ولا تعرف علّتهُ، مَا لَيسَ مِما ظَهرت عِلَّتُهُ وَفُهِمَت حكمتهُ، فإن مُلابِسَهُ قَدْ يَفْعَلُهُ لأَجل تَحْصِيل حكمته وفائدته، والْمُتَعَبِّدُ لا يفعل مَا تَعَبَّد بهِ إلاَّ إجلالاً لِلْرَب وانقيادا إلى طَاعَتِهِ)[2] واتە: ئەو کردەوانەی کە ڕەوان، یاخود لە ڕوانگەی شەرعەوە تەماشایان دەکرێ، دوو جۆرن، (بە هەمان شێوە وەك ئەوانی دیکە دەڵێ:) یەکەمیان: (کە مەبەستی پێ هەڵسوکەوتەکانە) ئەوەیە کە بەرژەوەندییەکی پێ وەدەست دێ، یاخود خراپەیەکی پێ دوور دەخرێتەوە، یاخود هەم بەرژەوەندییەکی پێ وەدەست دێو هەم زیانو خراپەیەکی پێ

---

[1] - ص١١٢.

[2] - ج١، ص٢٨.

دوور دەخرێتەوە، کە لە شەرعدا پێی دەگوترێ: (مَعْقُول الْمَعْنى) واتە: عەقڵ تێی دەگات و حیکمەتەکەی دەزانێت. جۆری دووەمیان: ئەوەیە کە ئێمە بۆمان دەرناکەوێ، کە ئایا چ بەرژەوەندییەکی وەدی هێناوەو چ زەرەرێکی دوور خستۆتەوە؟ واتە: حیکمەتەکەی دیار نیە، کە پێی دەگوترێ (التَعَبُّد) بەندایەتیی کردن بۆ خوا، ئنجا ئەو شتانەی کە لەجۆری پەرستن (تعبّد)ن، لەبەر ئەوەی مرۆڤ حیکمەتەکەیان نازانێ، زیاتر ملکەچییان بۆ خوا تێدا دەردەکەوێ، لەوانەی کە حیکمەت و هۆیەکەیان دەزانرێ، کە ڕەنگە ئینسان لەبەر قازانجەکەیان، ئنجامیان بدات نەك لەبەر خوا، بەڵام جۆری پەرستن، خاوەنەکەی تەنیا بەمەبەستی بەگەورە گرتنی پەروەردگارو فەرمانبەریی بۆکردنی ئەنجامی دەدات، بێ ئەوەی لەحیکمەت و هۆکارەکەی تێبگات، بۆ وێنە: نوێژی شێوان سێ ڕکاتە، نوێژی عەسر چوار ڕکاتە، بۆچی؟ دەبێ حەوت جار بە دەوری کەعبە بخولێینەوەو طەواف بکەین، حیکمەتەکەیان دیارنیە بۆ ئێمە، ئەوە پێی دەگوترێ: پەرستن (التَعَبُّد)، بەڵام ئەوەی کە حیکمەتەکەی دیارە، بۆ وێنە: کەسێك کەسێکی کوشت دەبێ بکوژرێتەوە، کەسێك داوێن پیسیی کرد، دەبێ سزا بدرێ، کەسێك دزیی کرد دەبێ سزا بدرێ، ئەوە دیارە لەبەرچی؟ بۆ ئەوەی سەرو ماڵ وناموسی خەڵکی پارێزراوبێ، ئەوانە حیکمەتەکەیان دیارە، ئەوانە پێیان دەگوترێ: هەڵسوکەوتەکان و نەرێتەکان.

٥- هەروەها یەکێکی دیکە لە زانایان لەو بارەوە، کە زانایەکی هاوچەرخە (مُحَمَّد بْن إبراهيم بن عبدالله التويْجري) لە کتێبی (مُخْتَصَر الفِقْه الإسلامي)دا دەڵێ: (الإسلام دين كَامل جَاءَ بتَنظيم المعَامَلات بَيْنَ الخَالِق وَالمَخلُوق، بالعِبَادات الَّتِي تُزَكيّ النُّفُوس وتَطَهِّرُ القُلُوب، وَجَاءَ بتَنظيم المعَامَلات بين المَخلوقين بَعضُهُمْ مَعَ بَعْض، كَالبيُوع والنِّكاح والمَوَارِيث

وَالحدُود وَغَيْرِهَا لِيَعيش النَّاس إِخْوَة في أَمن وَعَدلٍ وَرَحْمةٍ يؤدّون حق الله وحق عباده)[1] واتە: ئیسلام بەرنامەیەکی تێرو تەواوە، هاتوە بۆ ئەوە کە هەڵس وکەوتەکانی نێوان ئینسان‌و بەدیهێنەر ڕێك بخات، بە چەند عیبادەتێك کە دەبنە هۆی پاکبوونەوەی دڵ‌و دەروونی ئینسان‌و تەزکیە بوونی نەفس، وە هەروەها هاتوە بۆ ڕێکخستنی هەڵسوکەوتەکانی نێوان دروست کراوەکان لە نێوان خۆیاندا، وەك: کڕین‌و فرۆشتن‌و، میرات‌و نیکاح‌و سزاو غەیری ئەوانە، تاکو خەڵك بە شێوەیەکی خوشك‌و برایانەو بە هێمنیی‌و ئاسایش‌و بە دادگەریی‌و بە بەزەیی یەوە پێکەوە بژین، هەم هەقی خوا جێبەجێ دەکەن‌و هەم هەقی بەندەکانیش.

کەواتە: ئەوە پێنج نموونە لەقسەی زیانایان، ئەگەرنا هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن. بەڵام لێرەدا پێویستە ئەوەمان لێ تێك نەچێ کە ئەگەر چەمکی گشتی وشەی عیبادەت (عبادة) بێنین، عادەتەکانیش دەبنەوە بە عیبادەت، چونکە ئەویش "واتە: هەڵس‌و کەوت" تۆ بۆیە ئەنجامی دەدەی کە پاداشتت هەبێ‌و پێی لەخوا نزیك بکەویەوە، کە دیارە ئەوەش عیبادەتە، بەڵام لە ڕاستییدا عیبادەت بەچەمك‌و واتا تایبەتیی‌وتەسکەکەی، بریتیە لەوەی کە ئینسان لە نێوان خۆی‌و خوادا ئەنجامی دەدات، کە ئەمجۆرە پێی دەگوترێ: (العبادات المحضة) واتە: عیبادەتە ڕووتەکان.

ئنجا مادام کردەوەی ئینسانەکان بەگشتی دەبنەوە بە دوو بەش: خواپەرستییەکان (عبادات) هەڵس‌و کەوت‌و نەریتەکان (معاملات وعادات).

---

[1] - الباب الرابع: المعاملات، ص٣٧٣.

ئێمە پێشێ دەبێ بزانین عیبادەت چییە؟ وە عادەتیش چییە؟ واتە پێناسەیان بکەین، هەڵبەتە ئەوەش زۆر هەڵدەگرێ، بەڵام من بە کورتیی ئەوە باس دەکەم:

## پێناسەی (العِبادَات) و (العَادَات):

### أ/ پێناسەی (العِبادَات):

١-(راغب الأصفهاني) کە زانایەکی زۆر ناودارە لە شیکردنەوەی وشەکانی قورئاندا، دەڵێ: (العبودية : إظهار التذلل والعبادة أبلغ منها لأنها غاية التذلل ولا يستحقها الاّ من له غاية الإفضال، وهو الله تعالى، ولهذا قال تعالى : ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴿٢٣﴾ ﴾[1] الإسراء، واتە: (عبودیة) بریتییە لە دەرخستنی ملکەچیی، بەڵام عیبادەت ئەو واتایە زیاتر دەگەیەنێ، چونکە عیبادەت واتە: دەربڕینی ئەوپەڕی ملکەچیی، کە ئەویش هیچ کەسێك شایستەی نیە، مەگەر کەسێك خاوەنی ئەو پەڕی نیعمەت و چاکەبێت، ئەویش خوای بەرزە بۆیەش خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوەو فەرمانی کردوە کە جگە لەو نەپەرستێ، واتە: جگە لەو ئەوپەڕی ملکەچیی بۆ نەکرێ، کەواتە: عیبادەت یانی چی؟ یانی: ئەو پەڕی ملکەچیی.

٢-(المعجم الوسيط) کە فەرهەنگێکی هاوچەرخە، ئەویش ئاوا پێناسەی

[1] - مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٤٢.

عیبادەت دەکات و سادەتر دەیهێنێ و، دەڵێ: (العبادة : الخضُوع لِلإِلَـهِ عَلَى وَجْهِ التَّعْظِيم ، والعِبَادةُ : الشَّعَائِر الدِينيَة)[1] واتە: عیبادەتی بە دوو شێوە لێکداوەتەوە، یەکەمیان: ملکەچیی بۆ پەرستراو لەسەر شێوەی بە گەورەگرتن، وە بە مانای دروشمەکانی خواپەرستیی (نوێژ، ڕۆژو، زەکات، حەج، زیکر، دوعا ... هتد)، عیبادەت ئاوا پێناسە دەکات.

## ب/ پێناسەی (العَادَات):

١-(راغب الأصفهاني) دەڵێ: (العَادَةُ اسمٌ لِتَكرير الفِعْلِ والإِنْفعَال حَتَّى يصير ذَلِكَ سَهْلاً تعاطيهِ كَالطَبْع وَلذلك قيلَ : العَادَةُ طَبيعَة ثانية)[2]، واتە: عادەت ناوە بۆ کردەوەیەك کە دووبارە بێتەوە، وەبۆ کاردانەوەیەك کە دووبارە بێتەوە، وە بە شێوەیەکی وای لێ بێ کە ئینسان بە ئاسانیی بیکات، بۆیەش گوتراوە: (العَادَةُ طَبيعَة ثانية)، عادەت سروشتی دووەمە.

٢-(إبْنُ تَيْمِية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە کتێبی (القواعد النورانية الفقهية)دا دەڵێ: (وَأَمَّا الْعَادَاتُ فَهِيَ مَا اعْتَادَهُ النَّاسُ فِي دُنْيَاهُمْ مِمَّا يَحْتَاجُونَ إلَيْهِ)[3] واتە: عادەت بریتیە لەوەی کە خەڵك خوویان پێوە گرتوە لەوەی کە پێویستییان پێیەتی لە کڕین و فرۆشتنەکان و لە هەڵسوکەوتەکان لە سەردانەکان لە مامەڵەکان و لەو شتانەی کە خەڵك پێویستییانە بۆ ژیانی دنیایان.

---

[1] – ص٥٧٩.

[2] – مفردات الفاظ القرآن، ص٥٩٤.

[3] – ص١١٢.

٣-هەروەها (المعجم الوسيط) دەڵێ: (العادة كُلُّ مَا اعتيد حَتَّى صَارَ يُفْعَلُ مِنْ غَيْر جُهْدٍ، والعَادةُ: الحالة تَتَكَرَّرُ عَلَى نَهجٍ واحد كَعادةِ الْحَيْضِ فِي الْمَرأة، جَمْعُهَا: عَادٌ وَعَادَاتُ وَعَوَائِد)[1] واتە: عادەت هەرشتێکە کە خووی پێوەگیرابێ، وە بە ئاسانیی بکرێ، وە عادەت هەر شتێکە کە دووبارە بێتەوە بە یەك شێوە، وەك: عادەی ئافرەت، کە مەبەست پێی حەیزە، وە وشەی (عادة) بە (عاد وعادات وعوائد) کۆدەکرێتەوە.

کەواتە: عیبادەت واتە: ملکەچیی بۆ خوا، وە ئەو شتانەی کە ئینسان دەیانکات بۆ دەرخستنی ملکەچیی خۆی بۆ خوا، بەڵام ئەو شتانەی کە خەڵك لە نێوان خۆیاندا دەیانکەن، وەك: خواردن و خواردنەوەو شادیی و خۆشیی و جەنگ و ئاشتیی، وە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە سیاسییەکان و کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکان، ئەوانە پێیان دەگوترێ: نەریتەکان و هەڵسوکەوتەکان (العادات والمعاملات).

بەڵێ، عیبادەت هەر شتێکە کە بەو مەبەستە دەیکەی، پێی لە خوا نێزیك بکەویەوە، وە شتێکە کە لە نێوان خۆت و خوادا ئەنجام دەدرێ، ئەمما مەرج نیە تەنیا عیبادەت پاداشتی هەبێ، عادەت و هەڵسوکەوتەکانیش ئەگەر نیەتی باشیان لەگەڵ دابێ، پاداشتیان هەر هەیە، بۆ وێنە: ئاو خواردنەوە، نان خواردن، بەڵکو هاوسەرگیریی، یان کاسبیی حەڵاڵ، بەڵکو سەرپەرشتیی کردنی کاروباری وڵات، هەموو ئەوانە کە لە هەڵسوکەوتەکان و لە عادەتەکانن، مادام بەشێوەیەکی شەرعیی ئەنجامیان بدەی، وە بەو نیەتەوە بن کە تۆ کردەوەیەکی باش ئەنجام بدەی، ئەویش

[1] - ص٥٩٤.

هەر پاداشتی لەسەرە، وە جاری واش هەیە ئینسان عیبادەتێک ئەنجام دەدات، بەڵام مادام نیەتەکەی ڕیابازیی بێ، پاداشتی نیە، بەڵکو سزای لەسەرە، وەك خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ۝٦ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ۝٧﴾الماعون، واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی کە لە نوێژەکانیان بێ ئاگان، ئەوانەی کە ڕیابازیی دەکەن، وە یارمەتی لە خەڵك دەگرنەوە.

جیاوازیی نێوان (عبادات و عادات و معاملات): دیارە زانایان قسەیان زۆر لێکردوە، بەڵام بەڕاستیی (الشاطبي) لە کتێبی (الموافقات)دا[1] بە کورتیی زۆر جوانی هێناوە، دەڵێ:

(الأصل في العبادات بالنسبة إلى المكلّف التعبد دون الإلتفات إلى المعاني، والأصل في العادات الإلتفات الى المعاني)، واتە: بناغە لە عیبادەتەکاندا بەنسبەت ئینسانەوە، بریتیە لە بەندایەتیی کردن بۆ خوا بەبێ ئەوەی سەرنجی حیکمەتەکەی بدات، (سەرنجی بدا بزانێ سوودی چییەو حیکمەتەکەی چییە؟) بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەسڵ لە عادەت و هەڵسوکەوتەکاندا، بریتیە لە سەرنجدانی سوودەکەیان و حیکمەتەکەیان.

بۆیە دەگێڕنەوە عومەر "خوا لێی ڕازی بێ" لە طەوافی کەعبەدا، بەردە ڕەشەکە (الحجر الأسود)ی ماچ کرد، دوایی گوتی: وەڵڵاهی دەزانم بەردێکی، نە زەرەرت هەیەو نە قازانج، وە ئەگەر پێغەمبەرم ﷺ نەدیبایە

[1] - الموافقات، ج٢، ص٢٥٦.

ماچی کردووی، ماچم نەدەکردی، واتە: ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە خوا پەرستییەکە، نازانێ سوودی چییە؟ بەڵام ملکەچییە بۆ خوا، یان حەوت جار دەسووڕێیەوە بە دەوری کەعبەداو، نابێ بیکەی بە هەشت جارو، نابێ بیکەی بە شەش جار، یان حەوت جار لە نێوان صەفا ومەڕوە دێی‌و دەچی، یان دەبێ حەوت وردکە بەرد بە سێ جێ جەمرەکاندا بدەی، یان دەبێ کاتێ کە ئیحرام دەبەستی هیچ شتێکت لەبەردا نەبێ، زریزەو تەقەڵ‌و قۆپچەو ئەوانەی پێوە بێ، وە دوو پەشتەماڵ بەخۆتەوە بگری، وە نابێ بۆنی خۆش بەکاربێنی‌و، نابێ نینۆکت بکەی‌و، نابێ موو لەخۆت هەڵبکێشی، یان نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتە، نوێژی شێوان سێ ڕکاتە، نوێژی بەیانی دوو ڕکاتە، بۆچی وایە؟ خوا وای داناوە.

ئنجا (شاطبي) باسی ئەوە دەکات کە ئایا بەلگەمان چییە لەسەر ئەوە کە عیبادەتەکان ئەسڵ تێیاندا دەرخستنی ملکەچییە بۆ خوا، بەڵام هەڵسوکەوتەکان ئەسڵ تێیاندا بریتییە لە دەرك کردنی حیکمەت‌و سوودەکەیان؟

دەڵێ:

**<u>بەلگەی یەکەم:</u>** بریتییە لە تێوەڕامان، بۆ وێنە: عیبادەتەکان وە ختێك کە تێیانەوە ڕادەمێنی، چی دەبینی؟ بۆ وێنە: خۆشۆردن‌و پاککردنەوە (الطهارة) دەڵێ: (الطَّهَارةُ تتعدَّى محلَّ مُوجِبِها) کەسێك سەرجێیی لەگەڵ خێزانی دەکات، بەڵام دوایی دەبێ هەموو جەستەی بشوات، نەك تەنیا ئەندامێکی! چونکە ئەوە عیبادەتە، ئنجا دەڵێ: پێنج نوێژە فەرزەکان چەند کردەومیەکیان تێدان کە ئەو کردەوانە لە نوێژەکاندا عیبادەتن، بەڵام لە دەرەوەی نوێژ بە عیبادەت دانانرێن، بۆ وێنە: ڕکووع بردن، هەر

لەخۆوە ڕکووع بۆ خوا بەری، لە نوێژدا نەبێت عیبادەت نیە، وە سەجدە بردن، مەگەر سەجدەی شوکر بێ، یاخود سەجدەی قورئان خوێندن، ئەگەرنا لە دەرەوەی نوێژدا سەجدە بردن عیبادەت نیە.

**بەڵگەی دووەم:** تەماشا دەکەی عیبادەتەکان بەستراونەوە بە کاتێکی دیاریکراو و بە شێوەیەکی دیاریکراوەو، بە پێچەوانەی عادەتەکان و هەڵس و کەوتەکانەوە، کە نەبەستراونەوە بەکات و شێوەی دیارییکراوەوە.

**بەڵگەی سێیەم:** ئنجا ئێمە تەماشا دەکەین لەو کاتانەدا کە خەڵك لە نووری پێغەمبەرایەتی دوور کەوتۆتەوە، لەو فەترانەدا کە پێغەمبەران "عليهم الصلاة والسلام" نەبوو ون، خەڵك لە ڕووی خوا پەرستییەوە زۆر بە هەڵەدا چووەو، شتی سەیرو سەمەرەیان پەرستوەو، بە جۆری سەیرو سەمەرە خوایان پەرستوە، بەڵام لە بواری هەڵسوکەوتەکان و تووشی ئەو جۆرە هەڵانە نەبوون.

ئەوە بە نسبەت عیبادەتەکانەوە، بەڵام کە تەماشای هەڵس و کەوت و عادەتەکان دەکەین و ڕادەمێنین، دەبینین خوای پەروەردگار حیکمەتی داناون لە هەڵسوکەوتەکاندا لە عادەتەکانداو، بەزۆریی حیکمەتەکەیانی ئاماژە پێداوە، بۆ وێنە: لە باسی تۆڵە سەندنەوەدا، کە کەسێ کەسێ بکوژێ، دەبێ بکوژرێتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەی عاقڵمەندان! لە تۆڵەدا ژیان هەیە بۆ ئێوە، بەڵکو پارێز بکەن، حیکمەتەکەی بەیان دەکات کە بۆچی خوا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، دەبێ بکوژرێتەوە؟ تاکو ژیانتان سەلامەت بێ، هەتا هەم کوژراوەکەش نەکوژرێ، وە هەم بکوژەکەش تووشی

سزا نەبێ.

یــان بــۆ وێنــە: کــە باســی قەدەغــە بــوونی شــەڕاب و قومــار دەکــات، دەفـــــەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾المائـــدة، واتـــە: شەیتان دەیەوێ دوژمنایەتیی و کینەو ڕقتان لە نێواندا پەیدا بکات بە هۆی شەڕاب و قومارەوە، وەلەیادی خواو لەنوێژ بتانگێڕێتەوە، ئایا هەر دەستی لـێ هەڵناگرن؟ قومارچییەکان و شەڕاب خۆرەکان، زۆر جار سەرو گوێلاکی یەکدی دەشکێنن و بەشەڕ دێن، هەروەها کەم وایە یادی خوا بکەن و نوێژ بکەن، وە ئەوە کە بکوژ میرات لە کوژراو نـاگرێ، ئەگەر بـاب و کوڕیش بـن، یاخود خزم بن، (القاتل لايرث) بۆچی؟ حیکمەتەکەی دیارە کە مـادام بۆیـە کوشتوویەتی میراتی لێ بگرێ، لە میراتەکەی بێبەش دەبـێ، وە ئـەو بنچینە شەرعییەش هەیە لەوبارەوە: (مَنْ اسْتَعْجَلَ شيئاً قَبْلَ أَوَانِهِ عُوقِبَ بِحِرْمَانِهِ)، بەڵێ، کە تەماشا دەکەین لـەو ماوانـەدا کـە خـەڵك پێغەمبـەرانیان "علیهم الصلاة والسلام" لـەنێودا نـەبوون، لـە حاڵێکدا کـە لـە بـواری بەندایـەتیی کردندا زۆر بە هەڵە داچوون و تووشی شتی سەیرو سەمەرە بوون، دەبینـین لــە بــواری هەڵســوکەوتەکاندا، هەرچــەندە تووشــی هەڵــە بــوون، بــەڵام تاڕادەیەکی زۆر توانیویانـە مـەداری خۆیـان سـاز بکـەن و توانیویانـە ژیـانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆیان ڕێك بخەن، کەواتە: عیبادەتەکان لـە مـەودای عەقڵ بەدەرن، بەڵام هەڵسوکەوتەکان لە مەودای عەقڵدان، بۆچی؟ چونکە عیبادەت، چ لایەنە تیۆریی (نظري)ەکەی کە بریتیە لە (ئیمان و عەقیدە)و چ لایەنــە کردەییەکــەی، کــە بریتیــە لــە پێشــکەش کردنــی دروشمــەکان:

هەڵسوکەوتە لەگەڵ خوادا "سبحانەوتعالى"، ئنجا هەڵسوکەوت و مامەڵەکردنیش لەگەڵ خوا، بەس خوا دەزانێ دەبێ چۆنبێ؟ بۆیە کاتێك ئینسان لە وەحی دوور دەکەوێتەوەو، پشت بە عەقڵ دەبەستێ بۆ ئەوەی مامەڵە لەگەڵ خوادا بکات، تووشی هەڵە دەبێ، بەڵام عادەتەکان و هەڵسوکەوتەکان بریتین لەچی؟ بریتین لە پەیوەندیی نێوان ئینسانەکان خۆیان، کە دیارە هەڵسوکەوتی نێوان خۆیان، ئەوەش لە مەودای عەقڵ دایە، بۆیە تاڕاددەیەکی زۆر، عەقڵ پەییان پێ دەبات، هەر بۆیەش لە بواری عیبادەتدا، واتە: چ لایەنی ئیمان و عەقیدەکەی، چ لایەنی دروشمەکان، شەریعەت چۆتە نێو وردەکارییەکانەوەو خاڵی خستۆتە سەر پیت، بەڵام لە بواری هەڵسوکەوتەکاندا، شەریعەت خاڵی نەخستۆتە سەر پیت و بۆشایی زۆری بەجێ هێشتوەو، تەنیا چوارچێوەی فراوانی داناوە، چونکە ئەوە لە مەودای عەقڵی ئینساندایە، جا زانایان لێرەدا بنچینەیەکیان داناوە، دەڵێن: (إجمال في المتغيرات تفصيل في الثوابت)، واتە: ئەو شتانەی دەگۆڕێن، شەریعەت بە کورتیی باسی کردوون، وە ئەو شتانەی کە ناگۆڕێن شەریعەت بە وردیی و تەفصیل باسی کردوون.

بۆ وێنە: عەقیدە ناگۆڕێ، عیبادەتەکان ناگۆڕێن و شەریعەت خاڵی تێدا خستوونەتە سەر پیتان، بەڵام هەڵسوکەوتەکان مامەڵەو بازرگانیی، پێکهێنانی دەوڵەت، بەڕێوەبردنی وڵات، فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە، پاکسازیی و چاکسازیی، ئەوانە لەبەر ئەوەی گۆڕانیان زۆر بەسەر دادێ، شەریعەت بە کورتیی باسی کردوون و، هێڵی گشتی و چوارچێوەی فراوانی بۆ داناون، بەڵام بۆشایی زۆری تێدا بەجێ هێشتوون، بۆ ئەوەی کە عەقڵی ئینسان پڕی بکاتەوە.

# بنەمای پێنجەم:
# بناغە لە خواپەرستییەکاندا قەدەغەبوون (حَظْر)و، بناغە لە هەڵس و کەوتەکاندا ڕەوا (مباح) بوونە



بەڕێزان!

لەڕابردوودا هەتا ڕاددەیەك تیشکمان خستە سەر مەسەلەی دابەشبوونی کردەوەکان بەگشتی بۆ دوو جۆری سەرەکیی: خواپەرستییەکان و، هەڵس و کەوت و نەریتەکان (العبادات، والمعاملات والعادات)، پاشان پێناسەی هەرکام لەخوا پەرستیی و نەریت (العبادة والعادة)مان کردو، جیاوازیی سەرەکیی نێوانیشیانمان خستەڕوو، ئێستاش لێرەدا هەوڵدەدەین چۆنیەتی هەڵس و کەوت و مامەڵەکردن لەگەڵ هەرکام لەپەرستشەکان و نەریتەکان (العبادات والعادات)دا بخەینەڕوو.

دیارە ئەم بنەمایەش گرنگیی و بایەخێکی زۆری هەیە لەم ڕۆژگارەماندا کە دەمانەوێ، خوا پشتیوان بێ، شەریعەت بکەینەوە سایەو سێبەری کۆمەڵگاکەمان و کالای بالای میللەتەکەمان، کە بەبێ لەیەك جیاکردنەوەی وردی سنووری نێوان خوا پەرستییەکان و هەڵس و کەوت و نەریتەکان، گیرۆدەی سەرلێشێوان و گرفتاریی گەورەو بێڕەزا دەبین.

دیارە بەخستنە ڕووی ئەم مەسەلەیەش مەبەستی ئەم قسانەم باشتر ڕوون دەبێتەوە.

ئنجا شایانی باسیشە کە ئەو بابەتەی سەرگەرمی توێژینەوەینی: (جەژنە ویادوبۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك) پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەم مەسەلەیەوە هەیەو، هۆکاری سەرەکیی بەهەڵەداچوونی ئەوانەی کە لەم بابەتەدا بەهەڵەداچوون، بریتیە لە حاڵی نەبوونیان لەم مەسەلەیەو لێ تێکەڵ بوونی خواپەرستییەکان و نەریتەکان (العبادات والعادات)، کە بێگومان زۆر لەیەك جیاوازن و، بناغەو شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ هەرکامێکیان نەك هەر جیاوازە، بگرە ڕاست پێچەوانەی ئەوی دیکەیە،

چونکە:

بناغەو ئەسڵ بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پەرستشەکان (العادات)دا، ئەوەیە کە بۆمان نیە لەخۆمانەوە هیچ جۆرە خوا پەرستییەك ئەنجام بدەین، مادام شەریعەت دیاریی نەکردبێ و داینەنابێ، واتە: ئەسڵ وەستان و شوێنکەوتن (الوقوف والإتباع)ە، بەلام بناغەو ئەسڵ بۆ مامەڵە لەگەڵ هەڵس و کەوت و نەریتەکان (المعاملات والعادات)دا، بریتیە لە ڕێپێدران و داهێنان (الجواز والإبداع)و، گرنگ ئەوەیە لەگەڵ دەقێکی شەریعەتدا تێکگیران دروست نەبێ.

واتە:

لەبواری خوا پەرستییەکاندا مەگەر ئایەتێکی قورئان یان زیاتر، یان دەقێکی ڕاست و ڕاشکاوی سوننەت هەبێ، ئەگەرنا بۆمان نیە هەنگاو بنێین و لەخۆمانەوە جۆرە خوا پەرستییەك دابێنین و ناو بنێین، بەلام لەبواری هەڵس و کەوت و نەریتەکاندا، ڕاست بەپێچەوانە: بۆمان هەیە هەر جۆرە مامەڵەو هەڵس و کەوتێك بکەین و، هەرجۆرە نەریت و هەڵس و کەوتێك پەیدا بکەین و دابێنین کە پێمان وایە، بەرژەوەندییەکان دابین دەکات، بەرژەوەندیی (مصلحة)یش، بریتیە لە دوورخستنەوەی زیانەکان و وەدەستهێنانی سوودەکان (دفع المضارّ وجلب المنافع)، وەهیچ جۆرە هەڵس و کەوت و نەریتێك قەدەغە نیە، مەگەر دەقێکی شەریعەتی ڕوون و بێ چەندو چوونی لەسەربێ، کە قەدەغەیەو ڕێ لێگیراوە.

هەڵبەتە حیکمەتی ئەوەش کە بناغەو ئەسڵ بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ خواپەرستییەکان و هەڵس و کەوتەکاندا بەوجۆرەیە کە پێچەوانەی یەکدین ئەوەیە کە:

خواپەرستییەکان مامەڵە کردنن لەگەڵ خوادا "سبحانه وتعالى"و دیارە بەس خواش خۆی دەزانێ کەپێویستە چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکرێ؟ چ مامەڵەی فیکریی کە لەئیمان و عەقیدەدا خۆی دەنوێنێ و، چ مامەڵەی کردەیی کە لە وەرگرتنی بەرنامەکان و پێشکەشکردنی دروشمەکان (أخذ الشرائع وتقديم الشعائر)دا خۆی دەنوێنێ، بەڵام هەڵس و کەوت و نەریتەکان، مامەڵەکردنی مرۆڤەکانن لەنێو خۆیاندا، لە هەموو بوارەکانی سیاسیی و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی و کۆمەڵایەتییدا، ئاشکراشە کە چۆنیەتی مامەڵە کردنی مرۆڤەکان لەنێوخۆیاندا، لەمەودای عەقڵی بەشەردایەو، مرۆڤ تا ڕاددەیەکی زۆر عەقڵی پێی دەشکێ، هەربۆیەش شەریعەت ئەگەر لەبواری خواپەرستییەکاندا نوختەی خستوونە سەرپیتان، لەبواری نەریت و هەڵس و کەوتەکاندا بەدانانی چوارچێوەیەکی فراوان و هێڵە گشتییەکان وازی هێناوەو، بۆشایی زۆری بەجێهێشتوە، کە مرۆڤ بەعەقڵی خۆی بەگوێرەی پێداویستی ژیان و گوزەرانی هەمیشە گۆڕاویی، لەڕێی کۆششکردن (إجتهاد)و تێفکرینی هێڵەگشتییەکانەوە، پڕی بکاتەوە.

ئنجا هەر لێرەشەوەیە کە زانایان بەڕستەی: (إجمال في المتغيرات وتفصيل في الثوابت)، واتە: بەکورتیی باسکردنی گۆڕاوەکان و، بەدرێژیی باسکردنی نەگۆڕەکان، تەعبیریان لەو حاڵەتەی شەریعەت کردوە.

ئێستاش با بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاترو، زانینی بەڵگەکانی ئەو بنەمایە لەقورئان و سوننەتدا، سەرنجی قسەو بیروڕای ژمارەیەك لەزانایان بدەین لەوبارەوە:

١- (ابن تيمية) "ڕەحمەتی خوای لێبێ" لە (مجموع الفتاوى)گەی خۆیدا[1] دەڵێ: (الأصل في العبادات أنْ لايشرع منها إلاّ ما شَرَّعهُ الله و الأصلُ في العادات أن لايُحظرَ منها إلاّ ما حَظَرَهُ الله)، واتە: بناغە لە عیبادەتەکاندا ئەوەیە کە هیچی شەرعیی نیە، مەگەر ئەوەی کە خوا دایناب‌ێ، وە بەپێچەوانەوە بناغە لە هەڵسوکەوت و نەرێتەکاندا، ئەوەیە کە هیچ شتێ قەدەغە نیە، مەگەر ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردبێ.

واتە: کەسێك بیەوێ عیبادەتێك بکا، دەبێ بزانێ، ئایا خوا فەرموویەتی: ئەو عیبادەتە بکە! یان نا؟ دەبێ ئیزنی شەرعی لەسەر بێ ئەوجار بیکا، ئەگەر نا کەس بۆی نیە لەخۆڕا بڵێ: جۆرە نوێژێك دەکەم، یاخود جۆرە ڕۆژوویەك دەگرم، دەبێ بەس ڕۆژوویەك بێ کە خوا فەرموویەتی یان پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" وە تەنیا نوێژێك بێ کە خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانە، چونکە عیبادەت هەڵسوکەوتە لەگەڵ خوادا "سبحانه و تعالی" هەڵسوکەوتیش لەگەڵ خوادا، هەر خوا دەزانێ دەبێ چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەی، بەڵام بەپێچەوانەوە بواری هەڵسوکەوتەکان و عادەت و نەرێتەکان، بۆمان هەیە هەموو هەڵسوکەوتەکان بکەین هەموو عادەت و نەرێتەکان ڕەچاوبکەین و مومارەسە بکەین، مادام دەقێکی شەرعیی ڕوون و بێ چەندو چوونی لەسەر نەبێ، کە ئەو هەڵسوکەوتە دیاریکراوە، قەدەغەیە.

هەروەها لە کتێبی: (القواعد النورانية الفقهية)دا[2] ڕوونتر ئەو بنچینەیە

---

[1] - ج١٤، ص٤٥.

[2] - ص١١٢.

دێنێ، هەڵبەتە زانایانی دیكەش هەر دەیهێنن، دەڵێ: (إنَّ تصرفات العِبادِ منَ الأقوال و الأفعال نوعان: عباداتٌ يصلحُ بها دينهم، و عاداتٌ يحتاجون إليها في دنياهم، وباستقراء أصول الشريعة نعلم أن العبادات التي أوجبها الله أو أحبَّها لايثبت الأمر بها إلاّ بالشرع، و أما العادات فهي ماعتاده النّاسُ في دنياهم مما يحتاجون إليه، و الأصل فيه عدم الحظرِ، فلايُحظرُ إلاّ ما حَظرهُ الله "سبحانه و تعالى" و ذلك لأنّ الأمر و النّهي هما شرع اللهِ، و العبادةُ لابد أن تكون مأموراً بها و لهذا كان أحمد و غيره من فقهاء الحديث يقولون: إنَّ الأصل في العبادات التوقيفُ، فلا يُشرَع منها إلاّ ما شَرَّعَهُ الله، و إلاّ دخلنا في معنى قوله تعالى: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾والعاداتُ الأصل فيها العفو، فلا يُحظرُ منها إلاّ ما حرَّمهُ، و إلاّ دخلنا في معنى قوله تعالى: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا ﴾.

واتە: كردەوەكانی بەندەكان (بەشەر) لە قسە و لە كردار بەگشتی دوو جۆرن: چەند خواپەرستییەك كە دینداریيانی پێ چاك دەكەن‌و دینداریيان پێك دەهێنن، وە چەند نەریتێك كە بۆ ژیانی دونیایان پێویستییان پێیانە، وە بەتێوەڕامانی بنچینەكانی شەریعەت (واتە: قورئان‌و سوننەت) دەزانین كە ئەو عیبادەتانەی خوا "سبحانە و تعالی" پێویستی كردوون یاخود پەسەندی كردوون (واتە: فەرزن یان سوننەتن) بەبێ فەرمانی شەرع ناچەسپێن (دەبێ دەقێكی قورئان یان دەقێكی سوننەت هەبێ ئەوجار دەزانین ئەو عیبادەتە هەیە، جا چ واجب بێ، چ سوننەت بێ) بەلاّم عادەتەكان یاخود هەڵسوكەوتەكان، ئەوە شتانێكن كە خەڵك لە ژیانی

دونیای خۆیاندا عادەتیان پێوەگرتوون و پێویستییان پێیانە (وەك ژن و ژنخوازیی دەعوەت و دەعوەتکاریی و جەنگ و ئاشتیی و کڕین و فرۆشتن) بناغە لەو هەڵسوکەوتانەدا قەدەغەنەبوونەو هیچی لێ قەدەغە نیە، مەگەر خوای پاك و بەرز قەدەغەی کردبێ، ئەویش لەبەرئەوە کە شەرعی خوا لە ئەمرو نەهی پێك دێ، عیبادەتیش دەبێ فەرمان پێکراوبێ یان بە شێوەی پێویست، کە پێی دەگوترێ: فەرز، یان بە شێوەی پەسەند، کە پێی دەگوترێ: سوننەت، بۆیەش ئیمام ئەحمەدو غەیری ئەویش لە شەرعزانانی فەرموودەناس گوتوویانە: بناغە لە خواپەرستییەکاندا وەستێنران (توقیف)ە (واتە: دەبێ بوەستی و بۆت نیە لەخۆوە عیبادەتێك بکەی) عیبادەت دەبێ خوا "سبحانه و تعالى" داینابێ و ئەگەر وانەکەین، دەچینە نێو مانای قسەی خوای بەرزەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾الشورى، واتە: یاخود ئایا ئەوانە چەند هاوبەشێکیان هەن، کە شتێکیان لە دین بۆ داناون، کە خوا مۆڵەتی لەسەر نیە؟! (کەواتە: دانانی حەڵاڵ و حەرام، دانانی عیبادەتەو ئەوەش حەقی خوای پەروەردگارە "سبحانه و تعالى" وە هەر کەسێك ئەوە بکاو عیبادەتێك دابنێ بە عینوانی دین، مانای وایە لەجیاتی خوا شەرعی بۆ خەڵك داناوە) بەڵام هەڵسوکەوتەکان بناغە تێیاندا دەستکراوەیی و ڕێپێدرانە، بۆیە هیچ شتێك لە عادەتەکان قەدەغە ناکرێ، مەگەر ئەوەی خوا قەدەغەی کردوە، ئەگەر نا کەسێك عادەتێك قەدەغە بکا کە خوا قەدەغەی نەکردوە، هەڵسوکەوتەکەی دەچێتە بازنەی ئەو فەرمایشتەی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم

﴿مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾﴾يونس، واتە: پێیان بڵێ: ئایا ئەو رزق و رۆزییە دەبینن کە خوا بۆی ناردوونەخوار، هەر لەخۆتانەوە حەڵاڵ و حەرامتان تێدا داناوە، بڵێ: ئایا خوا مۆڵەتی داون، یاخود بەناوی خواوە درۆ دەکەن و، خوا شتێکی قەدەغە نەکردووە و خۆتان قەدەغەی دەکەن؟!

کەواتە: هەر کەسێك شتێك لە خەڵك قەدەغە بکا کە خوا قەدەغەی نەکردبێ لە هەڵسوکەوتەکاندا، ئەوە لەڕاستییدا وەکو بڵێی خۆی لە خەڵك کردۆتە پەرستراو و، خۆی لێ کردوونە پەروەردگارو، خۆی کردۆتە شەرع دانەر!

٣-هەر لەوبارەوە (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) دەربارەی هەمان مەسەلە لە کتێبی (أصول الفقە المهمة)دا بە کورتیی دەیهێنێ و دەڵێ: (الأصل في العبادات الحظر، إلاّ ما وردَ عن الشارعِ تشريعهُ، و الأصل في العادات الإباحة، إلاّ ما وردَ عن الشارعِ تحريمهُ)،[1] واتە: بناغە لە عیبادەتەکاندا قەدەغە بوون و ڕێلێگیرانە، مەگەر ئەوەی کە شەرعدانەر خوا "سبحانه و تعالى" دایبنابێ، بەلاّم بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕێپێدرانە، مەگەر ئەوەی کە شەرع دانەر ڕێی لێگرتبێ، (دەنا هەمووی ڕەوایە).

٢- هەر لەوبارەوە (د.عبدالكريم زيدان)یش لە کتێبی (الوجيز في أصول الفقه)دا دوای ئەوەی کە باسی (مباح) دەکات، دەڵێ: (و على هذا فالأفعال من عقودٍ و تصرفات، و الأشياء من جمادٍ و حيوان و نبات، الأصل فيها الإباحة، فما لم يرد دليل من الشارع يدل على حكمها صراحةً فحكمها الإباحة إستصحاباً من

[1] - ص١٠٥، ١٠٦.

الإباحةِ الأصلية، هذا و إنّ حكم المباحِ أنه لا ثوابَ فيه ولا عقاب و لكنّ قد يُثابُ عليه بالنية و القصد، كمن يمارس أنواع الرياضة البدنية بنية تقوية جسمه ليقوى على محاربة الأعداء)،[1] واتە: لەسەر ئەو بناغەیە: کردەوەکان لە گرێبەستەکان و لە هەڵسوکەوتەکان (گرێبەستەکان واتە: گرێبەستی هاوسەرگیری، گرێبەستی نێوان دوو دەوڵەت، گرێبەستی کڕین و فرۆشتن، گرێبەستی سیاسیی لەنێوان خەڵك و حوکمڕاندا) هەموو ئەوانە، وە شتەکان لە ماددەی بێ ژیان و ئاژەڵ و ڕووەك (واتە: هەموو شتێك) بناغە تیایاندا بریتیە لە ڕێپێدران و هەموویان ڕەوان، هەڵسوکەوتەکان وە شتەکان هەموویان ڕەوان، مەگەر لە شەرع دانەرەوە بەلگەیەك هاتبێ بە ڕوون و ڕاشکاویی فەرموبێتی: ئەو شتە قەدەغەیە، ئەگەرنا حوکمەکەی بریتیە لە ڕەوایی و ڕێپێدران، چونکە لە ئەصڵدا هەموو شتەکان ڕێپێدراون، وە هەموو هەڵسوکەوتەکان ڕێپێدراون، ([2]چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ...﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة، هەرچی لەسەر زەوییە بۆ ئێوەم دروستکردوە، وەخوای پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ...﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بۆ ئێوەم دەستەمۆ کردوە، کەواتە: هەموو شتێك بۆ ئێمە حەڵاڵ و ڕەوایە، مەگەر ئەوەی خوای کاربەجێ جیای کردبێتەوە) وە حوکمی ڕەوا (مباح) ئەوەیە کە نە پاداشتی لەسەرەو نە سزای لەسەرە، بەڵام جاری وا هەیە مرۆڤ شتێکی موباح دەکا،

---

[1] - المطلب الخامس: المباح، ص٤٨.

[2] - ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادکردنی خۆمە.

بەڵام بە نیەت بۆی دەبێتە مایەی پاداشت (بۆ وێنە: ئاودەخواتەوە، بۆئەوەی جەستەی بەهێز بێت و بتوانێ ئەرکە شەرعییەکان جێبەجێ بکات، هاوسەرگیریی دەکات، بۆئەوەی کە نەسل و وەچەی پەیدابێ و خۆی و بەرانبەرەکەی لە حەرام و گوناح بپارێزێ) وەك کەسێك کە چەندان جۆرە وەرزشی جەستەیی دەکات بۆئەوەی بەدەنی بەهێز بێت و، دوایی بتوانێت لەبەرانبەر دوژمناندا بەهێزبێ.

بەڵام من دەڵێم: ئەگەر لەبەرانبەر دوژمنانیشدا بەهێزنەبێ، هەر لە خودی خۆیدا بەدەن بەهێزبوون، شتێکی پەسەندو شتێکی باشە، کەواتە: کاتێك کە باسی هەڵسوکەوتێك دەکرێ، جا چ یادو بۆنەیەکە، چ نەرێتێکە، هەر هەڵسوکەوتێك بێ، ئەو کەسەی کە دەڵێ: ئەو شتە ڕەوایە، پێویست ناکات بەڵگە بێنێتەوە چونکە لە ئەصڵدا هەڵسوکەوتەکان ڕەوان، بەڵکو دەبێ ئەو کەسە بەڵگە بێنێتەوە کە دەڵێ: ئەو هەڵسوکەوتە قەدەغەیە، بۆ وێنە: یەکێك دەڵێ: یادکردنەوەی لەدایك بوونی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" قەدەغەیە، دەڵێین: بەڵگەت چییە؟ یان یەکێك دەڵێ: یادکردنەوەی ڕۆژی نەورۆز قەدەغەیە، دەڵێین: بەڵگەت چییەو لەبەرچی؟ چونکە لە ئەصڵدا هەڵسوکەوتەکان ڕێپێدراو و ڕەوان، بۆیە دەبێ ئەو بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ناڕەوایی، بەڵام بەپێچەوانەوە، عیبادەت هەر کەسێك بڵێ: ئەو جۆرە خواپەرستییە دەکەم، دەڵێین: بەڵگەت چییە کە فەرزە یان سوننەتە؟ چونکە خواپەرستیی بەبێ بەڵگەی شەرعیی دروست نیە، بەڵام هەڵسوکەوت پێویستیی بە بەڵگەی شەرعیی ناکات، چونکە هەڵس و کەوت و عادەتەکان خۆیان لە ئەصڵدا ڕەوان و ڕێپێدراون.

حیکمەتەکەش ئەوەیە کە عیبادەت بریتیە لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خوادا

"سبحانه و تعالى" هەڵسوكەوتیش لەگەڵ خوادا دەبێ خوا پێت بفەرموێ: ئاوا هەڵسوكەوت بكە ! ئاوا نوێژم بۆ بكە، ئاوا ڕۆژوو بگرە، ئاوا یادم بكە، ئاوا دووعا بكە، ئاوا لێم بترسێ و پشتم پێ ببەستەو...هتد، وەخوا هەر بۆخۆی دەزانێ ناوەكانی كامانەن و سیفەتەكانی چی و چین؟ بەڵام هەڵسوكەوتی ئێمە لەنێو خۆماندا، لە مەودای عەقڵی خۆماندایە، بۆیە شەریعەت لە بواری عیبادەتدا، وە لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، نوختەی خستۆتە سەر پیت، هەر بۆیەش وەك دوایی باسی دەكەین، هەر شتێ لە بواری ئیمان و عەقیدەو عیبادەتدا زیادبكرێ، بیدعەتە، بەڵام لە بواری هەڵسوكەوتەكاندا، جا چ هەڵسوكەوتی سیاسیی بێ: حوكم و سیاسەت و دەوڵەتداریی، چ هەڵسوكەوتی بازرگانیی و ئابووریی بێ، چ هەڵسوكەوتی كۆمەڵایەتیی بێ، لە بواری هەڵسوكەوتەكاندا، شەریعەت نەچۆتە نێو وردەكارییەكانەوەو، چوارچێوەیەكی فراوانی داناوەو بۆشاییەكی زۆری بەجێهێشتوە بۆئەوەی خەڵك بەعەقڵی خۆی پڕی بكاتەوە، بۆیە لە بواری هەڵسوكەوتەكاندا بوارێكی زۆر هەیە بۆ داهێنان (إبداع)، ئنجا پەیداكردن و ئیبتیداع لە دیندا چەندە خراپە، داهێنان لە بواری دنیادارییدا هێندە پەسەندو بگرە پێویستە.

٤-(إبن عثيمين)یش لەو بارەوە كە بناغە لە عیبادەتەكاندا، بریتیە لە ڕێ لێگیران، مەگەر شەرع شتێكی دیاریكردبێ، وە بناغە لە هەڵسوكەوت و عادەتەكاندا، بریتیە لە ڕێ پێدران، مەگەر شەرع شتێكی قەدەغە كردبێ، واتە عەكسی یەكدیین، لەوبارەوە لە كتێبی: (شرح الأربعين النووية)[1] لە شەرحی

[1] - ص١٢٢،١٢١.

ئەم فەرمودەیەدا کە دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُو رَدٌّ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧١٨))، واتە: هەر کەسێك کردەوەیەك بکات، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ڕەتکراوەیە، کە مەبەستی پێ عیبادەتە، جا لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا (إبن عثيمين) دەڵێ: (مَنْطُوق الْحَدِيث: أنهُ إذا لَمْ يَكُن عَلَيْهِ أَمر اللَّهُ وَرَسُولِهِ فَهُوَ مَردُودٌ، وَهَذَا في العِبَادَاتِ لاشَكّ فيه، لأَنَّ الأَصْل في العِبَادَات الْمَنع حَتَّى يَقُوم دَليل عَلَى مَشرُوعِيَّتهَا، فَلَو أَن رَجُلاً تَعبد لله عزّوَجَلَّ بشيءٍ وأنكر عَلَيْهِ إنسان، فَقَالَ: مَا الدَّليل عَلى أنهُ حَرَامٌ؟ فَالقَول قَول الْمُنْكِر فَيقُول: الدَّلِيل: هُوَ أَن الأَصْل فِي العِبَادَات الْمَنْع وَالحَظر حَتَّى يَقوم دَليل عَلَى أَنَّهَا مَشروعَة، أَما غَيْر العِبَادَات فَالأَصْل فِيهَا الْحل، سَواءً مِنَ الأَعيَان، أَو مِنَ الأَعْمَال، فَإِنَّ الأَصْل فِيهَا الْحِلُّ، مِثَال الأَعيَان: رَجل صَاد طَيْراً ليأكله، فأُنكر عَلَيْهِ آخر، فَقَالَ: مَا الدَّليل على التَحريم؟ فالقَولُ قَوله هُوَ، لأَنَّ الأَصْل الحِلَّ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالى: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾البقرة، ومثال الأعْمَال: رَجُل عمل عملاً في بيتِه، أو في سيارته، أو في لباسه، أو في أي شيء من أمور دنياه، فأنكرَ عَلَيْهِ رَجل آخر، فَقَالَ: أَينَ الدَّليل على التحريم؟ فالقَول قول الفاعل، لأن الأصل الحل)

واتە: ئەم فەرموودەیە بە ڕواڵەتی بێژەکەی ئەوە دەگەیەنێ، کە هەر کردەوەیەك فەرمانی خواو پێغەمبەری خوای لەسەر نەبێ، ڕەتکراوەیە ئەوەش هیچ گومانی تێدا نیە، کە مەبەست پێی عیبادەتەکانە، نەك هەڵسوکەوتەکان، لە عیبادەتەکاندا دەبێ خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەقیان لەسەر کردبێ، ئنجا بۆ ئێمە شەرعییە، چونکە بناغە لە عیبادەتەکاندا بریتیە لە ڕێ لێگیران، هەتا بەڵگە دەبێ لەسەر شەرعیی بوونی، (وێنە دێنێتەوە) ئەگەر پیاوێك بە جۆرێك خوای پایە بەرزی پەرست، یەکێکی دیکە ئینکاریی لێکردو گوتی: بۆ بەم شێوەیە خوا دەپەرستی؟ وە ئەوەی کە خوا پەرستییەکەی کردوە، گوتی:

بەڵگەت چییە لەسەر ئەوە کە قەدەغەیە؟ ئەوە قسە قسەی ئەوکەسەیە کە ڕەخنەی لێ گرتوە، ئەو کەسەی کە ڕەخنەی لێ گرتوە دەڵێ: بەڵگەم ئەوەیە کە ئەسڵ لە عیبادەتەکاندا ڕێ لێگیرانو، قەدەغە بوونە، مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر ئەوەی کە شەرعییە، تۆش بەڵگەت نیە، کەواتە: نابێ بە جۆرێك خوا بپەرستی کە خوا نەیفەرمووە، بەڵام غەیری عیبادەتەکان، چ شتەکان (أعیان) وە چ کردەوەکان (أعمال)، ئەسڵ تێیاندا بریتیە لە حەلاڵیی[١]، وێنەیەك لە شتان، (مثال الأعیان): کەسێك باڵندەیەك ڕاو دەکات بۆ ئەوەی بیخوات، یەکێکی دیکە ئینکاریی لێدەکاتو دەڵێ: ئەو باڵندەیە قەدەغەیە، بەڵگەت چییە کە دەیخۆی؟ ئەویش پێی دەڵێ: ئەدی تۆ بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی کە ئەم باڵندەیە قەدەغەیە؟ قسەی کامیان دەیخوا ؟! قسەی ئەو کەسە کە باڵندەکە دەخوا، قسەی ئەو دەیخوات، چونکە ئەسڵ ئەوەیە کە هەموو شتەکان حەلاڵن، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: (خوا ئەو کەسەیە کە هەرچی لەزەوییدایە بۆی دروستکردوون) البقرە ٢٩، (کەواتە: بابای باڵندە خۆر ناچار

---

[١] - هەندێکیان لەو بارەوە گوتبوویان: دەبێ بڵێین: (الأشـیاء النافعـة) شتە سوود بەخشەکان، بەڵام هیچ کام لەزانایان ئەو قەیدەیان نەخستۆتە سەری، چونکە خوا هەرچی لە زەوییدا دروست کردوە، بۆ ئینسانەکانی دروست کردوە، ئیدی ئەوەی کە زەرەری هەیە، ئەوە قەدەغەیە، لەبەر ئەوەی کە زەرەری هەیە، وە کردەوەکانو جموجۆڵەکان هەموویان حەلاڵو ڕەوان، بەڵام کردەوەو هەڵسوکەوتێك نارەوایە، کە دەقێکی شەرعیی لەسەر بێ، بۆیە پێویست ناکات ئەو قەیدەی بخەیە سەری: (ئەو شتانەی کە سوودیان هەیە، حەلاڵن) ئەوە پێویست ناکاتو وا بڵێین، چونکە ئەوەی کە زەرەری هەبێ، ئەوە شەرع دیاریکردوە، کە حەرامە: ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ ﴿١١٩﴾﴾ الأنعام، واتە: ئەوانەی کە حەرامن، خوا بە تەفصیلیی بۆی باس کردون، ئیدی ئەوەی دەمێنێتەوە هەمووی حەلاڵە.

نیە ئەو باڵندەیە حەدیسێکی لەسەر بهێنێتەوە، بۆ وێنە: ژیانداریکی دەریایی ئەگەر کاتی خۆی خواردنی باو نەبووبێ، هەر شتێکی دیکە لەو پەڕی ئەفریقیا، لەو پەڕی ڕۆژهەلاتی ئاسیا جۆرە باڵندەیەك، جۆرە ژیانداریك پەیدادەبێ، کە لە کۆمەڵگای پێغەمبەردا ﷺ نەبووە، بەڵگەمان چییە کە حەڵاڵە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ: هەموو شتێکم لە زەوییدا بۆ ئێوە دروست کردوە، ئنجا کە زەرەری نەبوو مانای وایە حەڵاڵە)[1]، وێنەی کردەوان کە ئەسڵ تێیاندا ڕەواییە: پیاوێك لە ماڵی خۆی، یاخود لە سەیارەکەیدا، یاخود لە بەرگو پۆشاکیدا، یان لە هەر شتێکدا، کردەوەیەك لە کاروباری دنیاییدا دەکات، پیاوێکی دیکەش ئینکاریی لێ دەکات، دەڵێ: بۆ وا بەو شێوەیە ڕەفتار دەکەی؟ (بۆ وێنە: سەیارەکەی دەشوات، ماڵەکەی بۆیاغ دەکات، یان پەردەی بۆ دەگرێتەوە، یەکێکیش ڕەخنەی لێ بگرێ) قسە قسەی ئەوکەسەیە کە کردەوەکە دەکاتو، ئەوەی دیکە دەبێ بەڵگە بێنێتەوە، (تۆ بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی کە نابێ دیوار بۆیاغ بکەی؟ بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی نابێ بەردی حەللانی لێبدرێ؟ بەڵگەت چییە لەسەر ئەوەی کە نابێ خانوو سێ قات بێ؟ ئنجا ئەگەر بەڵگەی نەبوو لەسەر قەدەغەبوونی، ئەوە لەسەر ئەسڵی خۆی دەمێنێتەوە، کە بریتیە لە حەڵاڵیی).

هەروەها (إبن عثيمين) هەر لەوبارەوە لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا کە دەفەرموێ: **{وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ، فَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ}** (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧١٨٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٠٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٧٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٢٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥)

[1] – ئەوەی نێوان کەوانەکانم بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەست زیاد کردوە.

وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٩٣٧))، واته: خۆتان دوور بگرن لـه شـته پەیـداکراوەکان، چـونکه هـەموو پەیـداکراوێك گومڕاییـه، دەڵـێ: **(والأمورُ المحدثةُ يَعني بِهَا صلَوات وَسَلامه عَلَيْهِ الْمحدثات في دينِ اللّه، وذَلِكَ لأن الأَصْل فِيمَا يدين بِهِ الإنْسَان ربَّه وَيتَقَرَّب بهِ إلَيْه، الأَصْل فِيه الْمَنْعُ وَالتَّحْرِيْم، حَتَّى يَقُوم دَلِيل عَلَى أنهُ مَشروع، وَلهَذَا أَنكَر اللَّهُ عَزَّوجَلَّ عَلَى مَن يُحَلِّلون ويُحَرِّفُون بأهوائهم، فَقَالَ تَعَالى:** ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾﴾ **النحل، وأنكر على من شَرَّع في دينه ما لم يأذن به، فقَال:** ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾﴾ **الشورى، وَقَالَ:** ﴿قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾﴾ **يونس**[1]، واته: پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێ: **(وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ)**، واتـه: خۆتـان لـه شـته پەیداکراوەکان دوور بگرن، مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیداکراوەکانه له بواری دینداریی (تَعَبُّد)دا، چونکه ئەسڵ لەوەدا که ئینسان پێی له پەروەردگاری نێزیك دەبێتەوە، وە خۆی پێ لەخوا نێزیك دەخاتەوەو بەندایەتیی بۆ دەکات، ئەسڵ تێیدا ڕێگیرانو قەدەغەبوونە، هەتا بەڵگە دەبێ لەسەر ئەوەی که شەرعییە، بۆیەش خوا "سبحانه وتعالى" ئەوانەی که شتیان حەڵاڵو حەڕام کردوە، به ئارەزووی خۆیان، ڕەخنەی لێ گرتوون، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ

[1] - شرح رياض الصالحين، ج١، ٥٤٧،٥٤٨.

﴿ﮋ﴾ (١١٦) النحل، واتە: بە زمانی بە درۆتان مەڵێن ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، تاکو سەرەنجام درۆ بەناوی خواوە هەڵبەستن، بێگومان ئەوانەی درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن سەرفراز نابن.

هەروەها ڕەخنەی گرتوە لەوانەی شتێك لەدیندا بڕیار دەدەن کە مۆڵەتی لەسەر نیە: ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَـٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ ﴾ (٢١) الشوری، واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە شتێکیان لە دین بۆ دادەنێن، کە خوا فەرمانی لەسەر نیە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ ﴾ (٥٩) یونس، واتە: ئایا خوا ئیزنی داون، یاخود درۆ بە ناوی خواوە دەکەن؟!

بەڵام لە کاروباری عادەتیی‌و کاروباری دنیاییدا ئەو ڕەخنەیە ناگیریٚ لە پەیداکرانیان، مەگەر دەقێك هەبیٚ لەسەر قەدەغەبوونیان، ئەگەرنا هەرچی کاروبارە دایبهێنەو پەیدای بکە، مادام دەقێکی لەسەر نەبیٚ، یاخود نەچێتە ژێر بنچینەکەوە، کە بەڵگەبیٚ لەسەر قەدەغەبوون، ئەوە لەسەر ئەسڵی خۆیەتی، کە ڕەوایی‌و حەڵاڵییە.

بۆیە من دەڵێم، وە گوتوومە: (**الأَصْلُ في العِبَادات الإتباع، والأَصْلُ في المُعَامَلات الإبدَاع**)[1] کە پێم وایە زۆرباش لەگەڵ قسەی زانایاندا دێتەوە، واتە: بناغە لە خوا پەرستییەکاندا بریتیە لە شوێنکەوتن، (شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ) بەڵام بناغە لە عادەتەکان‌و لە هەڵس وکەوتەکاندا بریتیە لە داهێنان.

---

[1] - ڕەنگە پێشتریش ئەو قسەیە کرابیٚ‌و مەرج نیە من دامهێنابیٚ، گرنگ ئەوەیە قەناعەتم پێیەتی.

بۆیەش هاوەڵان "خوا لێیان ڕازی بێ"، ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی، هەر چوار خەلیفە ڕاشیدەکان و باقی هاوەڵان، لە کاروباری عیبادەت و دینداریدا، بەموو لەوەی پێغەمبەریان لانەداوە ﷺ، بەڵام ئایا لە بواری سیاسەتی شەرعیی و ئیدارەی دەوڵەت و بازرگانیی و ئابووریی و جەنگ و ئاشتیی و...هتددا، تەماشایان کردوە، داخۆ پێغەمبەر ﷺ چی کردوە، ئەوانیش کت و مت وابکەن؟! بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا ﷺ خەندەکی لێداوە بە دەوری مەدینەدا، ئەوانیش خەندەك لێ بدەن؟ یان پێغەمبەر ﷺ مەنجەنیقی بەکارهێناوەو، حەتمەن دەبێ ئەوانیش مەنجەنیق بەکاربێنن؟! یان پێغەمبەر ﷺ بە تیرو کەوان شەڕی کردوە، ئەوانیش هەر بە تیروکەوان شەڕێ بکەن؟ یان پێغەمبەر ﷺ چۆن صوڵحی کردوەو لەگەڵ کێ و لەسەرچی صوڵحی کردوە، ئەوانیش وابکەن؟! نەخێر، بەڵکو تەماشایان کردوە، مەصڵەحەت چۆن تەحقیق دەبێ، وایانکردوە، باکاتی خۆی پێغەمبەری خواش نەیکردبێ! کەواتە: کاروباری دنیا، عادەت و هەڵسوکەوتەکان، ئەسڵ تێیاندا داهێنانە، وە سەنگی مەحەکیش دابین کردنی بەرژەوەندییەکانە، چۆن بەرژەوەندیی دابین بێ، دەبێ ئاوا بکرێ، مادام ناشەرعیی نەبێ.

# بنەمای شەشەم:
# شتی ڕەوا بەهۆی بەهەڵە بەکارهێنرانی و خراپە ڕەگەڵ خرانییەوە، حوکمە ئەسڵییەکەی ناگۆڕێ و قەدەغە نابێ

ئەمیش بنەمایەکی دیکەی گرنگەو ڕەچاوکردنی لەبواری مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵس و کەوت و نەریتەکاندا بەگشتی و، بەتایبەت بۆنەو یادەکاندا، ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ بۆ پارێزران لەهەڵەو لادان و خلیسکان.

دەشتوانین زۆر بەڵگان لەسەر ڕاستیی ئەم بنەمایە بێنینەوە، بەڵام بەم چەند بەڵگەیە وازی لێدێنین:

١- ئەگەر بێت و هەر هەقێك ناهەقێکی لەگەڵ تێکەڵ کرا، وازی لێ بێنین و، هەر حەڵاڵێك، حەرامێکی لەپەنادا کرا، دەستبەرداری ببین و هەر چاکەیەك خراپەیەکی لەگەڵ ئاوێتەبوو، هەردووکیان پێکەوە توڕبدەین، ئەوە هیچ هەق و حەڵاڵ و چاکەیەکمان بەدەستەوە نامێنێ !

ئایا دەگونجێ زەماوەندو هاوسەرگیریی قەدەغە بکەین، چونکە جاری وایە هەڵس و کەوتی ناشەرعیی، وەك ڕەشبەڵەکی تێدا دەکرێ؟

یان ئایا دەگونجێ گەشتە بەهارەو سەیران قەدەغە بکەین، چونکە کەسانێك جاری وایە لەپەنای ئەوەدا شەڕاب دەخۆنەوە؟!

یان ئایا دەگونجێ کڕین و فرۆشتن و بازرگانیی قەدەغە بکەین، بەپاساوی ئەوە کە هەندێك لەبازرگانەکان، بازرگانیی بەشتی حەرامەوە دەکەن و، هەندێکیان سوێندی بەدرۆ دەخۆن و هەندێکیان فێڵبازو قۆڵبڕن و...هتد؟!

٢- خوای دادگەر بەخاوەن کتێبەکانی فەرمووە: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٧١﴾ آل عمران، واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی هەق و ناهەق تێکەڵ دەکەن و هەق پەنهان دەکەن لەحاڵێکدا کە دەشزانن "ئەوە هەقە"؟

کەواتە: هەق و ڕاستیی، ئەگەر ناهەق و درۆشی لەگەڵ تێکەڵ بکرێ، هەر

هەق و ڕاستییەو، نابێ لەبەرچاومان بکەوێ.

٣- (عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: بينما النبيُّ ﷺ يخطب اذا هو برجل قائم، فسأل عنه، فقالوا: أبو إسرائيل نذَر أن يقوم في الشمس ولا يقْعُدَ ولا يَستَظِلَّ ولا يتكلَم ويصوم، فقال النبي ﷺ: مُروه فليتكلَّمْ وليقْعُدْ وليتِمَّ صَوْمَهُ) رواه البخاري، واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس "خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ" دەڵێ: لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، پیاوێکی بینی ڕاوەستابوو، لەبارەیەوە پرسیاری کرد؟ گوتیان: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە لەسەر خۆی نەزر کردوە کە بەڕۆژوو بێ و، لەبەرخۆر بوەستێ و، دانەنیشێ و، نەچێتە بەر سێبەرو، قسەش نەکات!

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پێی بڵێن: با قسە بکات و دابنیشێ و "بچێتە بەرسێبەرو" ڕۆژووەکەیشی تەواو بکات.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتە ناهەق و ناشەرعییانەی، ئەو پیاوە لەگەڵ ڕۆژوو گرتنە هەق و شەرعییەکەدا تێکەڵی کردوون، کە قسە نەکردن و، دانەنیشتن و نەچوونە بەرسێبەر بوون، هەڵیوەشاندوونەوەو، ئەوەش کە هەق بووە هێشتوویەتەوە.

کەواتە:

ئێمەش پێویستە هەروابکەین و هەمیشە (کا)ی ناهەق و (دان)ی هەقی قسەو کردەوان بە تەرازوو پێوەری شەریعەت لەیەك جیا بکەینەوەو، هەر یەکەیان مامەڵەی پڕ بەپێست و شایستەی خۆی لەگەڵدا بکەین.

کەواتە:

لەکاتێکدا کەسانێك لەبۆنەو جەژنێکدا ڕەفتارو هەڵس و کەوتی هەڵەو ناشەرعییان لێ دەپشکوێتەوە، نابێ عاتیفییانە حوکم بدەین و بەهۆی هەڵەو ناشەرعییەکانەوە، حوکمێکی نەرێنیی (سلبي) گشتی بەسەر کۆی بۆنەو جەژنەکەیان دابدەین، کە بەڵگەیەکی ڕوونی شەرعییمان لەسەر قەدەغەبوونی بەدەستەوە نیە.

نیازو مەبەستو پاڵنەر، حوکمی شتەکان دەگۆڕێ، چۆن؟ بۆ وێنە: کەسێك خەڵك دەعوەت دەکا، دیارە دەعوەتی خەڵكو خواردنی دان بە خەڵك (إطعام الطعام) شتێکی باشە، وەك خوا مەدحی کەسانێکی کردووەو فەرموویەتی: ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الإنسان، واتە: خواردنێك کە خۆشیان دەوێ، دەیدەن بە نەدارو هەتیو و دیل..، بەڵام یەکێك دەعوەتێك ساز دەکات بۆ کۆمەڵێك بەرپرس، وەك بەرتیلێك، بۆ ئەوەی ئەگەر داوایەکی لێ کردن، چاویان بنووقێنێ، ئەوە دەعوەت کردنەکەی لێ حەرام دەبێ، چونکە بۆ مەبەستێکی خراپە، وە لەسەریشی گوناهبارە.

یان کەسێك گەشتو سەیران دەکا، بەڵام بەو نیازو مەبەستە گەشتو سەیران دەکا کە لەوێ گوناه بکا، چونکە نیەتەکەی خراپە، یەکەمین هەنگاو کە دەینێ، گوناهبارە، یاخود کەسێك دەڵێ: دەچمە سەفەر، دیارە چوونە سەفەر حەڵاڵە، بەڵام ئەو نیازی وایە بچێتە سەفەر بۆ ئەوەی نەفەرێك بکوژێ، یان ڕێگریی بکا، ئەوە یەکەم هەنگاو کە لەماڵەوە دەینێ گوناهبارە، چونکە نیەتو هاندەرەکەی ئەوەیە کە بچێ لەوێ گوناه بکا، ئنجا لێرەدا چ بەباری چاکە دابێت، چ بەباری خراپەدا، جاری وا هەیە شتەکە موباحە، بەڵام یەکێك ئەو شتە دەکات بە مەبەستی وەدەست هێنانی پاداشت، وەك پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: (ما من مسلمين يلتقيان فيتصافحان الا غُفِرَ لهما قبل ان يفترقا) رواه أبو داود، واتە: دوو مسوڵمان کە بەیەکەوە تۆقە دەکەن، بەرلەوەی لەیەك جیابنەوە لەلایەن خواوە دەبوردرێن.

دیـاره تۆقـەکردن هەڵسوکەوتەو عـورف و عادەتێکـە، بـەڵام مـادام بـە مەبەسـتی برایـەتیی دەیکـەن، گوناهیـان لێ دەبێتـەوە، هـەروەها پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێ بە هاوەڵەکانی فـەرموو: ئـەوە خێـرە، ئـەوە خێـرە، ئـەوە خێـرە، ئەوە خێرە، دوایی فەرمووی : (وفِي بُضْعِ أحدِكُمْ صدقة) رواه مسلم.

واتە: وە یەکێك لە ئێوە کە سەرجێیی لەگـەڵ خێزانـی دەکـات پاداشـتی هەیـە، گوتیـان: چـۆن یـەکێك لـە ئێمـە ئـارەزووی خـۆی جێبـەجێ دەکـاو پاداشتی هەیە؟ فەرمووی: ئەگەر ئارەزووەکەی لە حەڕامدا جێبـەجێ بکـات حـەڕام نیـە؟ گوتیـان بـا، فـەرمووی: مـادام لـە حەڵاڵـدا جێبـەجێی بکـات (خۆی و هاوسەری لەگوناه بپارێزێ) پاداشتی هەیە.

هەروەها بوخاریی و موسلیم لە عومـەری کوڕی خـەتتابـەوە "خـوا لێـی ڕازی بێ" هێناویانە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (**انما الأعمال بالنيات و انما لكل امريءٍ ما نوى، فمن كانت هجرته الى الله و رسوله، فهجرته الى الله و رسوله، ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو امرأةٍ ينكحها، فهجرته الى ما هاجر اليه**) •واتە: بێگومـان کردەوەکـان

بە پێی نیـەتن، وە هـەر کەسـە چـۆنی نیـەت هێنـاوە، ئـاوا بـۆی دەنووسـرێ (ئنجا نموونە دەهێنێتەوە بە کۆچ کـردن و دەفـەرموێ:) کەسـێك بـەو نیـازە کۆچ بکات کە بچێ بۆلای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ (لە مەککەوە بچێ بـۆ مەدینـە بـۆلای دەوڵـەتی ئیسـلامیی، بـۆ ئـەوەی لـەوێ فەرمانبـەریی خـواو پێغەمبەری خوا بکات) ئەوە بەو پێیە کۆچەکەی بۆ دەنووسرێ، یـەکێکیش کـۆچ بکـا بـۆ ئـەوەی بەرژەوەندییـەکی دونیـایی دەسـت بکـەوێ، یـاخود ئافرەتێك بینێت، ئەویش کۆچەکەی بەو پێیـە بـۆ دەنووسـرێ، کـە لـە دڵـی خۆی گرتوە.

کەواتە: موباحەکانیش بە پێی نیەتن و، ئەگەر مرۆڤ نیەتەکەی باش بێ، پاداشتی لەسەریان هەیەو بۆی دەبن بە طاعەت، بەڵێ عادەت بە نیەتی باش دەبنە عیبادەت، وە بە پێچەوانەشەوە عادەتە باشەکان و شتە ڕەوایەکان، ئەگەر هاندەری خراپیان لە پشتەوە بێ، ئەوە قەدەغە دەبن، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو عیبادەتیش ئەگەر هاندەرو پاڵنەری خراپی هەبێت، نەك هەر بە عیبادەت دانانرێ، بەڵکو خاوەنەکەی لەسەریشی سزادەدرێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ﴿٦﴾﴾ الماعون، واتە: ئنجا سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی، کە لە نوێژەکان بێئاگان، ئەوانەی کە ڕیابازیی دەکەن.

وەك دەبینین: خوای کاربەجێ و دادگەر ڕایگەیاندوە، کە کەسانێك کە نوێژێکی بێ ڕووح و بێئاگایانەی ڕیابازانەو تەنیا بۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵك دەیکەن، نەك هەرنابێ چاوەڕێی پاداشت بن، بگرە سزاو جەزرەبەش چاوەڕێیانە. دیارە ئامانجیشم لەخستنەڕووی ئەم بنەمایەو ئەم ڕاستییەی شەریعەت، سێ شتی سەرەکییە:

یەکەم: ئەوانەی کە نیاز پیسن و، لەپەنای بۆنەو جەژن و یادێکدا دەیانەوێ و هەوڵدەدەن مەبەستێکی خراپ بێننەدی، با ئەو کارەی دەکرێ لەئەسڵدا ڕەواو شەرعیی و بێ ئیشکالیش بێ، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە بەگوێرەی نیازو مەبەستە خراپەکەی خۆیان گوناهبارو عەیبدارن، بەڵام خودی بۆنەو یادەکە بەهۆی ئەوەوە قەدەغە نابێ.

دووەم: کاروچالاکییە لە بنەڕەتدا ڕەوا (مباح)یەکان، خاوەنەکانیان

ئەگەر بەنیازو مەبەستی باشەوە ئەنجامیان بدەن و، ڕوویان پێ لەخواو ڕەزامەندییەکەی و، هێنانەدی بەرژەوەندییەکی شەرعیی بکەن، لەسەریان پاداشتت دەدرێتەوە، وەك فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڕوونیی دەیگەنن.

سێیەم: کەسێك کە بەکارێك هەڵدەستێ، بۆ نموونە: ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری خواوە ﷺ، یان شەو ڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)ی، یان کۆچکردنی لە مەککەوە بۆ مەدینە، یان جەنگی بەدر...هتد، کە "وەك دوایی باسی دەکەین" ئەمانەو هاووێنەکانیان لەبنەڕەتدا لەبازنەی هەڵس و کەوت و نەریتەکاندان و، حوکمیان بەگوێرەی نێوەڕۆك و شێوازیان، دەگۆڕێ، ئەگەر تەنیا وەك کارێکی ڕەواو عادەتێکی باش پێی هەڵسێ، ئەوە بەئەندازەی ڕێك و پێك و شەرعیی بوونی و خوا پێ مەبەست بوونی و هێنانەدی بەرژەوەندیی مسوڵمانان، پاداشتی هەیە، بەلام ئەگەر بەخەیاڵی خۆی "هەرچەندە لەواقیعدا واش نیە" بەجۆرێك لەخواپەرستیی (عبادة) دابنێ، ئەوە بێگومان بەپێی ئەو نیازو مەبەستە هەڵەو ناشەرعییەی، لەسەر ئەوکارەی گوناهبارەو، کردەوەکەشی بە بیدعەت (بدعة) دادەنرێ، بۆچی؟!

چونکە بێگومان "وەك لەبنەمای نۆیەمدا دەیخەینەڕوو" هەرشتێك لەبواری ئیمان و عەقیدەو عیبادەتدا پەیدا بکرێ و دابهێنرێ، بە پەیدا کراو و بیدعەت (محدثة وبدعة) دادەنرێ و، بیدعەت و داهێنانیش لەئیسلامدا هەمووی هەر خراپەو گومڕاییەو، هیچ چاکەیەکی تێدا نیە.

جا ئەو کەسە بەگوێرەی تێگەیشتنی هەڵەی خۆی و، بەپێی نیازو مەبەستەکەی، خۆی گیرۆدەی نازناوی داهێنەر (مبتدع) لەدیندا دەکات و،

خۆی گوناهبار دەکات، لەحاڵێکدا کە هەر هەمان کردەوە، ئەگەر "وەك خۆی لەواقیعدا وایە" تەنیا بەکردەوەیەکی ڕەواو عادەتێکی باشی داهێنراوی مسوڵمانانی دانابایە، ئەو ئیشکالانەی بۆ دروست نەدەبوون.

کەواتە:

وەك بینیمان نیازو مەبەست (نیة) کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەگۆڕینی حوکمی کردەوەکاندا، بەهەموو جۆرەکانیانەوە، نیازو مەبەستی باش، عادەتەکانیش "مادام لەخودی خۆیاندا ناشەرعیی نەبن" والێدەکات کە خاوەنەکەیان پاداشتی هەبێ‌و، نیازو مەبەستی خراپیش وا لەخاوەنەکەی دەکات، کە تەنانەت لەسەر عیبادەتەکانیش قەرزار بێتەوەو سزا بدرێ!

وەك گوتراوە: حوکم کردن لەسەر هەرشتێك لقێکە لە لێتێگەیشتنی (الحكم على شيء فرع عن تصَوُّرِهِ) بۆیە پێویستە سەرەتا بزانین مەبەست لە: جەژن و یادو بۆنەکان چییە؟!

سەرەتا با تەماشای فەرهەنگەکانی زمان بکەین:

١-(راغب الأصفهاني) لەبارەی پێناسەی جەژن (عید)ەوە گوتوویەتی:

(والعيد ما يعود مرة بعد أخرى وخُصَّ في الشريعة بيوم الفِطر ويوم النَّحْر، ولما كان ذلك اليوم مَجْعولاً للسرور في الشريعة كما نبَّه النبيُّ ﷺ بقوله: ((أيام أكلٍ وشرب وبعالٍ)) صار العيد في كل يوم فيه مسرّة، وعلى ذلك قوله تعالى: ﴿...ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا ﴿١١٤﴾﴾ المائدة، والعيد كل حالةٍ تعاود الإنسان).[1]

واتە: جەژن (عید) ئەوەیە کە جار لەدوای جار بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە، وەلەشەریعەتدا تایبەت کراوە بەڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربانەوە، وەلە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو ڕۆژە لەشەریعەتدا بۆ شادیو خۆشیی دانراوە، وەك پێغەمبەر ﷺ هۆشداریی داوە کە فەرموویەتی: ((ڕۆژانی خواردنو خواردنەوەو جووتبوونن))، جەژن بۆ هەر ڕۆژێك کە خۆشییەکی تێدابێ بەکارهاتوە، قسەی خوای بەرزیش هەر لێرەوەیە کە فەرموویەتی: ((سفرەیەکمان لەئاسمانەوە بۆ بنێرە خوارێ کە بۆمان ببێتە جەژن)) المائدە -١١٤-، وەجەژن هەر حاڵەتێکە کە بۆ مرۆڤ دووبارە بێتەوە.

کەواتە:

(راغب الأصفهاني) وشەی جەژن (عید) بەسێ واتایان بەکاردێنێو دەڵێ:

---

[1] - مفردات ألفاظ والقرآن، ص٥٩٤.

سێ واتای هەن:

أـ هەردووك ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان.

ب ـ هەر ڕۆژێك كە خۆشیی و شادییەكی تێدابێ.

ج ـ هەر حاڵەتێك كە بۆ مرۆڤ دووبارە بێتەوەو بگەڕێتەوە.

٢-المعجم الوسيط:

ئەمیش لەبارەی جەژن (عید)ەوە گوتوویەتی: (العید: مایعود من همٍّ أو مرضٍ أو شوقٍ أو نحوه، والعید: كل یوم یحتفل فیه بذكرى كریمة أو حبیبة،ج: أعیاد).[١]

واتە: جەژن (عید) هەر حاڵەتێكە كە بۆ مرۆڤ بگەڕێتەوە، لەخەفەت، یان نەخۆشیی، یان شادیی، یان وێنەی ئەوە، وەجەژن هەر ڕۆژێكە كە ئاهەنگی تێدا بگێڕرێ و خۆشحاڵیی تێدا پیشان بدرێ، بەبۆنەی بیرەوەرییەكی گرنگ یان خۆشەویست، كۆیەكەی (أعیاد)ە، واتە: جەژنەكان.

٣-المنجد:

ئەمیش ئاوا پێناسەی جەژن (عید)ی كردوە:

(العید: ما اعتادك من مرضٍ أو حزنٍ أوهَمٍّ ونحو ذلك، الموسم، كل یومٍ فیه جمع أو تذكار لذي فضل أو حادثةٍ مهمة...)[٢]، واتە: جەژن ئەوەیە كە بۆلات دێتەوە لەنەخۆشیی، یان دڵتەنگیی، یان خەفەت وە وێنەی ئەوە، وە جەژن ڕۆژی كۆبوونەوەیە، وەهەر ڕۆژێكە كە خڕبوونەوە یان بیرەوەرییەكی تێدابێ بۆ خاوەن چاكەیەك، یان ڕووداوێكی گرنگ...

---

[١] - ص٦٣٥.

[٢] - ص٥٣٦.

کەواتە:

وشەی (عید) کە لە کوردییدا (جەژن)ی لەبەرانبەردایە، ماناو چەمکی هەرکام لە بۆنە (مناسبة) و یاد (ذکری)ش دەگرێتە خۆی‌و، پوختەی ماناو چەمکی وشەی (عید):

هەر ڕۆژێك‌و بۆنەیەك‌و بیرەوەرییەك، کە خۆشیی‌و شادیی، یان نەخۆشیی‌و گرفتاریی‌و ناڕەحەتیی تێدا بووبێ‌و، خەڵك گرنگیی پێبدەن‌و، تێیدا کۆببنەوەو یادی بکەنەوە، دەگرێتەوە.

کەواتە:

ئەو قسەیەی کە دەڵێ: وشەی جەژن (عید) دروست نیە بۆ جگە لە دوو جەژنەکانی ڕەمەزان‌و قوربان (یوم الفطر و یوم النّحر) بەکاربهێنرێ، قسەیەکی سادەو سەرکێلاّنەیەو، وێڕای قسەی شارەزایانی زمان، پێچەوانەی دەقی قورئان‌و دەقی سوننەتی پێغەمبەریشە ﷺ، بابزانین چۆن؟!

**<u>یەك</u>:** لە قورئاندا وشەی (عید) لەسەر زمانی (حوارییین)ی عیسا (علیه السلام) بۆ بۆنەی دابەزینی سفرەیەکی خوایی لە ئاسمانەوە بەکارهێنراوە:

﴿قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١٤﴾ المائدة.

**<u>دوو</u>:** پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکام لە:

ڕۆژی عەرەفەو، ڕۆژەکانی تەشریق‌و، ڕۆژی جومعەشی بەڕۆژانی جەژن ناوبردوون، وەك لەم فەرموودانەدا هاتوە:

أ- (يوم عرفة و يوم النّحر و أيّام التّشريق عيدنا أهل الإسلام و هي أيّام أكلٍ و شربٍ) أخرجه أحمد: ١٧٤١٧، و أبوداود: ٢٤١٩، و الترمذي:٧٧٣،

والنسائي:٣٠٠٤، و الحاكم:١٥٨٦، وصَحَّحه كل من الترمذي و الحاكم و الألباني.

واتــە: ڕۆژی عەرەفــەو ڕۆژی ســەربڕین {واتــە: (١٠)ی ذي الحجــة} وە ڕۆژانــی تەشــریق {واتــە: ســێ ڕۆژەکــانی دوای ســەربڕین} جــەژنی ئێمــەی ئەهلی ئیسلامن، وە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

ب- (إنّ يوم الجمعة يَوْمُ عيدٍ، فلاتجعلوا يـوم عيـدكم يـوم صيامكم، إلاّ أن تصوموا قَبلَهُ أو بَعده) أخرجه أحمد:٨٠١٢، و الحاكم:١٥٩٥، وابـن خزيمـة:٢١٦١، و البزار عن أبي هريرة، و قال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

واتە: بێگومان ڕۆژی هەینی ڕۆژی جەژنە، دەجا ڕۆژی جەژنتان مەکەنە ڕۆژی بەڕۆژوو بوونتان، مەگەر ڕۆژێك پێشی، یان دوای بەڕۆژوو بن.

کەواتــە: وشــەی (عیــد) لــە قورئــان و سوننەتیشــدا، بــۆ غــەیری دوو جەژنەکەی ڕەمەزان و قوربانیش بەکارهاتوە.

ئنجا ئەگــەر ســەرنجی یــادو بۆنــەو جەژنــەکانیش بــدەین، لــە واقیعــی بەرچاودا، دەگەینەوە هەمان ئەنجام کە شارەزایانی زمـان لـەبارەی چـەمك و واتای وشـەی (عیـد)ەوە گوتوویانـەو، وەك گوتیشمان وشـەی (عیـد) کـە بـە (أعیاد) کۆدەکرێتـەوە، چەمك و واتای سـەرجەم بۆنـەو یادەکـانیش لەخۆیـدا کۆدەکاتەوە.

ئنجا ئایا جەژن و یادو بۆنەکان، لە واقیعدا چین و چۆنیان دەبینین؟!

# پۆلێن کردنی جەژن ویادو بۆنەکان

دەتوانین جەژن ویادو بۆنەکان، بە گشتی بۆ سێ جۆری سەرەکیی پۆلێن بکەین:

**جۆری یەکەم:** ئەوانەی کە ڕەگ و ڕیشەیەکی ئایینی "بەمانا ئاسمانییەکەی"یان هەیە، بەنسبەت کۆمەڵگای مسوڵمانی ئێمەوە، وەك: هەردووك جەژنی ڕەمەزان و قوربان، یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، یادی شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء و المعراج)، کۆچکردن (الهجرة)، جەنگی بەدر، ئازادکردنی مەککە...هتد.

**جۆری دووەم:** ئەوانەی کە بەهۆی ڕووداو و پێشهاتێکی نەتەوەیی و نیشتیمانییەوە پەیداگراون، بەنسبەت کۆمەڵگای ئێمەوە، وەك: ڕاپەڕینی جەماوەریی ساڵی (١٩٩١)، کۆچڕەو، یەکەمین هەڵبژاردن لە ساڵی (١٩٩٢)دا، کارەساتی بەناو ئەنفال، کیمیایی بارانی هەڵەبجە لە ساڵی (١٩٨٨)دا،...هتد.

**جۆری سێیەم:** ئەوانەی کە مۆرکێکی گشتیی و جیهانییان هەیەو پەیوەستن بە بابەتێکی گرنگەوە، یان داکۆکییکردن لەسەر مافەکانی توێژێك لە خەڵك وەك: ڕۆژی دایك، ڕۆژی منداڵ، ڕۆژی کرێکاران، ڕۆژی ئازادیی ڕۆژنامەگەریی، ڕۆژی بەرەنگاربوونەوەی جگەرەکێشان ...هتد.

ئنجا ئەگەر بە وردیی سەرنجی هەرکام لەو سێ جۆرەی جەژن و یادو بۆنەکان ن بدەین، دەبینین خاڵی هاوبەشی نێوانیان بریتیە لە گردبوونەوەو کۆبوونەوەی خەڵك، چ بۆ خۆشیی و شادیی دەربڕین، ئەگەر بۆنەکە بیرەوەرییەکی خۆش بێ، وە چ بۆ یادکردنەوەو هێنانەوە بەرچاوی ئەو

بیرەوەرییە، ئەگەر ڕووداو و کارەساتێکی ناخۆش بووبێ، وە چ بۆ گرنگیی و بایەخدان بەو بابەتەی کە بۆنەکەی بۆ دانراوە، جا چ ئایینی بێ، چ نەتەوەیی و نیشتیمانیی بێ، چ جیهانیی...

شتێکی ئاشکراشە کە هەموو ئەو کارو چالاکییانەی لەنێوان مرۆڤەکان خۆیاندا دەکرێن، وەك: گردبوونەوەو کۆبوونەوە، شادیی و خۆشحاڵیی دەربڕین، ماتەمیتیی و دڵتەنگیی دەربڕین، دەرس و پەند وەرگرتن، داکۆکییکردن لەسەر مافەکانی توێژێك...هتد. دەچنە بازنەو خانەی هەڵس وکەوت ونەریتەکان (المعاملات و العادات)ەوەو، هیچ پەیوەندییان بە خواپەرستییەکان (عبادات)ەوە نیە.

ئێستاش با سەرنجی ئەم سێ بەڵگەیە بدەین، لەسەر ئەوە کە جەژن و یادو بۆنەکان، لەبازنەی هەڵس و کەوت و عادەتەکاندان:

١- وەك پێشتریش گوتمان، سەرجەم ئەو کارو چالاکییانەی لە بۆنەو یادو جەژنەکاندا ڕوودەدەن، تایبەتن بە مرۆڤەکان خۆیانەوەو، لەنێوان خۆیاندا ڕوودەدەن، تەنانەت دوو جەژنەکەی ڕەمەزان و قوربانیش، جگە لە نوێژەکەیان کە دروشمێکی ئایینییە، کردەوەکانی دیکەیان وەك: سەردان و چاك و چۆنیی و پیرۆزبایی و تۆقەو گەردن ئازادیی و...هتد، هەموویان هەڵس و کەوتی ئاسایی مرۆڤەکانن لەنێوان خۆیاندا، ئنجا پێغەمبەری خواش ﷺ بە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوە (أيَّام أكلٍ و شربٍ) پێناسەی کردوون.

هەڵبەتە پاداشت لەسەر وەرگرتنەوەی ئەو کارو چالاکییە خێرو باشانەی، کە لەو بۆنەو جەژن و یادانەشدا دەکرێن، لەگەڵ خواپەرستیی (عبادة) نەبوونیاندا تێك ناگیرێ، چونکە وەك پێشتریش گوتمان، بە نیازو مەبەستی باشەوە، کردەوە ئاسایی و عادەتییەکانیش، پاداشتیان دەبێ و دەبنە طاعەت.

٢- پێشتر لە پێناسەی عیبادەت و عادەتدا هێنامان، کە عیبادەت حیکمەتەکەی دیارنییە، بەڵام عادەت و هەڵس و کەوتەکان حیکمەت و بەرهەمەکانیان دیارن و، بە زاراوەی (الشاطبي) (معقول المعنی)ن.

ئنجا کاتێك کە سەرنجی جەژن و یادو بۆنەکان دەدەین، دەبینن حیکمەت و بەرهەمەکانیان دیارو بەرچاون، وەك:

**یەك:** زیندوو ڕاگرتنی بیرەوەرییەکان و لەبیرنەچوونەوەیان، تاکو پەندیان لێوەربگیرێ، ئەگەر ناخۆش و تاڵ بووبن، وەك کیمیایی باران و، بەناو ئەنفال، وە نیعمەت و چاکەی خوا لەیاد نەکرێ و سوپاسگوزاریی بۆبکرێ، ئەگەر خۆش و شیرین بووبن، وەك: ڕاپەڕین و، هەڵبژاردن و، دامەزراندنی حکوومەت...

**دوو:** بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

**سێ:** گرنگیی و بایەخدان بە هەندێ بابەت، یان هەندێ چین و توێژو داکۆکییکردن لە مافەکانیان.

**چوار:** خۆشیی و شادیی دەربڕین و، هەوای باڵی خۆدان و پشوودان و گەڕان..

٣- هەردووك جەژنی ڕەمەزان و قوربان، هەروەها ڕۆژەکانی ڕاوەستان لە عەرەفات و سێ ڕۆژ پاش جەژنی قوربان، کە بە (أيام التشريق) ناونراون، بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوە (أكل و شرب) دانراون، وە بە تایبەت هەردووك جەژن کە بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کراون بە بەدیلی دوو ڕۆژ کە کاتی خۆی خەڵکی شاری مەدینە گەمەو یارییان تێدا کردوون، کەواتە: مادام دوو جەژنەکە بەدیلی ئەو دوو ڕۆژەن، دیارە هەمان ئامانج کە لەو دوو ڕۆژە گۆڕراوە (اليومَين المُبدَلَين)دا هێنراوەتە دی، دەبێ لەو دوو ڕۆژە بەدیلە (اليومين البديلين)شدا بێتە دی!

با سەرنجی ئەم فەرمایشتانە بدەین:

١: (عن أنس قال: قدمَ النبيُّ ﷺ المدينة، ولهم يومان يلعبون فيهما في الجاهلية فقال: ان الله عزّ وجل قد أبدلكم الله بهما خيراً منهما: يوم النّحر، ويوم الفِطر) أخرجه أحمد:١٢٠٢٥، وأبوداود:١١٣٤، والنسائي في الكبرى:١٧٥٥، وأبو يعلى:٣٨٢٠، والحاكم:١٠٩١، وقال: صحيح على شرط مسلم، و البيهقي في شعب الإيمان:٣٧١٠.

واتە: پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە، کە خەڵکی مەدینە دوو ڕۆژیان هەبوون (لەساڵێدا) کە لە ڕۆژگاریی نەفامییدا یارییان تێدا دەکردن، فەرمووی: بێگومان خوا "عز و جل" دوو ڕۆژی باشتری بۆ لەجێیاندا داناون: ڕۆژی سەربڕین و، ڕۆژی ڕۆژوو شکاندن (واتە: جەژنی قوربان و ڕەمەزان).

دیارە بەپێی فەرموودەکەش دیارە ئەو دوو ڕۆژەی لە ئیسلامدا، کە جەژنی ڕەمەزان و قوربانن، لەجێی ئەو دوو ڕۆژەی سەردەمی نەفامیی دانراون، مادام دوو ڕۆژەکەی پێشوو ڕۆژانی گەمەو یاریی بوون، دیارە بەدیلەکانیشیان هەروان، چونکە بەدیل و جێگرەوە دەبێ لە جینسی گۆڕراو (مُبْدَل) بێ، بەڵام وادیارە ئەوان گەمەو یاریی هەڵەو ناشەرعییان تێدا کردوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕیونی، ئەگەرنا نەیدەگۆڕین.

بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە ڕۆژانی دوو جەژنەکە یاریی و گەمە تێداکردنیان ڕەوایەو، هەر لەسەر حاڵەتی ئەسڵیی خۆیان، کە گەمەو یاریی تێداکردنە، ماونەوە، دەقی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ وێنە:

٢: (عن عائشة رضي الله عنها قالت : دَخلَ رسول الله ﷺ و عندي جاريتان تُغَنِّيان بغناء بُعاثٍ، فاضطجع على الفراش و حوَّل وَجْهَهُ، فَدَخل أبوبكرٍ فانتهرني وقال : مِزمارُ الشيطان عند رسول الله ! فأقبل عليه رسول الله ﷺ فقال : دَعْهُما،

فلما غَفَلَ غَمَزتُهما فخرجتا، وكان يوم عيدٍ يَلعبُ السّودان بالدَّرَقِ والحراب، فإمّا سألتُ النبيَّ ﷺ، وإمَّا قال: تشتهين تنظرين؟ فقلت: نعم، فأقامني وراءه خدِّي على خَدِّه و هو يقول: دونكم يا بني أرفدَة! حتى إذا مَللتُ، قال: حَسْبُكِ؟ قُلت نعم، قال: فاذهبي) رواه بخاري.

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لێم وەژوورکەوت، لەوکاتەدا دوو کچ "یان دوو کەنیزەك"م لەلابوون گۆرانی ڕۆژی بوعاثیان دەگوت، ئەویش لەسەر جێگا ڕاکشاو ڕووی بەرەو ئەولا وەرسووڕاند، ئنجا ئەبوبەکر هاتەژوورو تێیخوڕیم و گوتی: چۆن دەبێ شمشاڵی شەیتان لە لای پێغەمبەری خوا لێبدرێ؟! پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی تێکردو فەرمووی: لێیان گەڕێ! ئنجا کاتێك (پێغەمبەری خوا) خافڵا، ئاماژەم بۆکردن و چوونەدەرێ، وە ئەو ڕۆژە جەژن بوو، ڕەشپێستەکان بە قەڵغانان و بە نێزان یارییان دەکرد، ئنجا یان من داوام لە پێغەمبەر ﷺ کرد، یان خۆی فەرمووی:

حەزدەکەی تەماشابکەی؟ گوتم: بەڵێ، ئەویش لەپشت خۆیەوە ڕایگرتم ڕوومەتم لەسەر ڕوومەتی بوو، وە دەیفەرموو: ئەی نەوەی ئەرفیدە دەی یاریی بکەن! هەتا کاتێك ماندوو بووم، فەرمووی: بەستە ؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: دە بڕۆ.

ئنجا دیارە پێشتریش لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ کە (أحمد و أبوداود و الترمذي و النسائي و الحاكم) هێناویانە، هێنامان کە هەر کام لە ڕۆژانی: عەرەفەو ڕۆژی سەربڕین و ڕۆژەکانی تەشریقی بە جەژنی ئەهلی ئیسلام داناون و فەرموویەتی: (و هي أيام أكلٍ و شربٍ) وە ئەوانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

هەروەها لەفەرموودەیەکی دیکەدا کە پێشتر ئەویشمان هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ لەمسوڵمانانی قەدەغەکردوە کە ڕۆژی جومعە کە ڕۆژی جەژنە، بکەینە ڕۆژی ڕۆژوو تێدا گرتن، کە جۆرێکە لەعیبادەت و، ڕۆژی جەژنیش ڕۆژی خواردن و خواردنەوەو یاریی و گەمەیە: (ان یوم الجمعة یوم عید فلا تجعلوا یوم عیدكم یوم صیامكم الاّ أن تصوموا أو بعده) رواه أحمد والحاكم وابن خزیمة والبزّار.

کەواتە:

هەر کەسێك دەعوای ئەوە بکات کە دوو جەژنەکان (بێجگە لە نوێژو زیکرەکان) خواپەرستیی (عبادة)ن، مانای وایە خواردن و خواردنەوەو گەمەو یاریی کردنی بە خواپەرستیی داناون، واتە: خواپەرستیی بە مانا تایبەتییەکەی، کە دیارە ئەوەش قسەیەکی پووچ و بێ بنەمایەو، خواردن و خواردنەوەو گەمەو یاریی و هاووێنەکانیان، لەجۆری هەڵس و کەوت و عادەتەکانن و هیچ پەیوەندییان بە عیبادەتەوە نیە، هەر چەندە ئەگەر بە نیازو مەبەستی باشەوە بکرێن، پاداشتیشیان لەسەرە.

## ئاگادارییەکی گرنگ

بەڵام لێرەدا پێویستە ئاگامان لە ڕاستییەکی گرنگ بێ، ئەویش ئەوەیە کە دانرانی دوو جەژنەکەو سەرجەم بۆنەو یادەکان بەهەرسێك جۆرەکانیانەوە، لە بازنەو خانەی هەڵس و کەوت و نەرێتەکان (المعاملات و العادات)دا، مانای ئەوە نیە کە هەموویان بێ بەندو مەرج (بلا قید و شرط) ڕەواو ڕێپێدراو (مُباح و جائز)ن!

بەڵکو پێویستە سەرنج بدرێن و، هەر کامێکیان نێوەڕۆك، یان شێوازێکی ناشەرعییانەی هەبێ، بە ناڕەوا دادەنرێ، بۆ وێنە:

ئەو یاد و بۆنانەی هاوبەش بۆ خوادانان (الشرك بالله)، یان جۆرێك لە کوفر دەگەیەنن، یان لە خودی خۆیاندا ناهەق و گوناهن، یان بەمەبەستی ڕەواج پێدان و بانگەشەکردن بۆ شتی حەرام و ناڕەوا ئەنجام دەدرێن...هتد، ئەوە بێگومان قەدەغەن، بەڵام نەك لەبەرئەوەی پێیان دەگوترێ: جەژن و یادو بۆنەو، ئەوانەش خواپەرستیین و هەرچی تێیاندا زیاد بکرێ بیدعەتە! بەڵکو لە سۆنگەی ئەوەوە کە نێوەڕۆك و شێوازێکی ناشەرعییانەیان هەیەو، بۆ ئامانجێکی ناشەرعیی دەکرێن.

بەڵێ، ئەگەر کەسێك یەکێك لە بۆنەو یادە ئیسلامییەکان بۆ نموونە: یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر (ذکری مولد النّبي) ﷺ بەهەڵە بەجۆرێك لە عیبادەت دابنێ، ئەوە بێگومان یادکردنەوەکەی بە بیدعەت دادەنرێ و، بیدعەتیش هەمووی گومڕایی و خراپە بەبێ هەڵاواردن (بدون استثناء)، وەك لە بنەمای نۆیەمدا قسەی لەبارەوە دەکەین.

هۆکاری سەرەکیی بەهەڵەداچوونی ئەوانەی کە سەرجەم یادو بۆنەو جەژنەکانیان "جگە لەوانەی دەقێکی شەرعییان لەسەرە" بە قەدەغەو ناڕەوا داناون، ئەوەیە کە یادو بۆنەو جەژنەکانیان بەگشتی بەجۆرێك لە عیبادەت داناوە، دیارە عیبادەتیش ئەگەر دەقێکی شەریعەتی ڕوون و بێ چەندوچوونی لەسەر نەبێ، بە زیادەو پەیداکراو (محدثة) و داهێنراو (بدعة) دادەنرێ و، بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خواش ﷺ هەموو پەیداکراو و داهێنراوێك لە ئاییندا گومڕایی و گوناهو ناشەرعییە.

بۆیە بە پێویستم زانی ئەم بنەمای نۆیەمە بریتی بێ لە ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای بیدعەت و، خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە بیدعەت تایبەتە بە عەقیدەو عیبادەتەوەو، هیچ پەیوەندیی بە بواری هەڵس و کەوت و نەریتەکانەوە نیەو، پێشتریش ڕوونمان کردەوە کە جەژن و بۆنەو یادەکان، لە بازنەو خانەی هەڵس و کەوت و عادەتەکاندان و، هیچ پەیوەندییان بە خواپەرستییەوە نیە.

## پێناسەی ( بدعة ):

١- **(راغب الأصفهاني) لەبارەی وشەی (إبداع)ەوە گوتوویەتی:**

(الإبداع: إنشاءُ صَنعةٍ بلا احتذاء و اقتداء و منه قيل: رَكيَّةٌ بديع، أي: جديدة الحَفْرِ، و إذا استعمل في الله تعالى، فهو إيجاد الشيء بغيرِ آلةٍ و لا مادة و لا زمان، و لا مكان وليس ذلك إلاّ لله.

والبديع يقال للمُبْدِع نحو قوله تعالى:﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ...﴿١١٧﴾ ﴾ البقرة، ويقال للمُبْدَع نحو: رَكِيَّةٌ بديع، و كذلك البدْع يقال لهما جميعاً، بمعنى

الفاعل، و المفعول و قوله تعالى: ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ... ﴾ الأحقاف، قيل معناه: مُبْدَعاً لم يتقدَّمني رسولٌ، وقيل: مُبدِعاً فيما أقوله.

والبدعة في المذهب: إيرادُ قولٍ لم يَستنَّ قائلُها و فاعلُها فيه بصاحب الشريعة و أماثلها المتقدّمة و أصولها المتقنة...)[1]

واتە: (إبداع) دروستکردنێکە کە شوێنکەوتن و چاولێکردنی تێدا نەبێ، لەوەوەش گوتراوە: (ركية بديع) واتە: بیرێك کە تازە هەڵکەندرابێ.

وە ئەگەر وشەی (إبداع) بۆ خوای بەرز بەکاربێ، ئەوە دروستکردنی شتێکە بەبێ ئامراز و بێ کەرەستەو بێ کات و بێ شوێن، ئەوەش بەس بۆ خوایە.

وە (بديع) بۆ پەیداکەر (مُبْدِع) بەکاردێ، وەك قسەی خوای بەرز ((پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوییە)) البقره-١١٧-، وە بۆ پەیداکراو (مُبْدَع)یش بەکاردێ، وەك: (ركية بديع) بیرێکی تازە لێدراو، وە وشەی (بِدْع) بۆ هەردووکیان دەبێ: بکەرو بەرکار، وە قسەی خوای بەرز: ((بڵێ من (بِدْع) نیم لە پێغەمبەران)) الأحقاف-٩-.

گوتراوە یانی: تازە پەیداکراو نیم کە لە پێش من هیچ پێغەمبەر نەهاتبن، وە گوتراوە یانی: پەیداکەر نیم لەوەدا کە دەیڵێم.

وە بیدعەت لە ئاییندا داهێنانی شتێکە کە بێژەرەکەی و ئەنجامدەرەکەی، تێیدا خاوەنی شەریعەت و وێنە پێشووەکانی و بنەما چەسپاوەکانی نەکردۆتە پێشڕەو و چاوساغی.

**٢- (العزّ بن عبدالسلام) ئاوا پێناسەی بیدعەتی کردوە:**

---

[1] مفردات ألفاظ القرآن، ص١١١-١١٠.

(البدعة: فعل ما لم يُعهَد في عصر رسول الله ﷺ).[1]

واتە: (بیدعەت) بریتیە لە کردنی شتێك کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ نەبووبێ.

جا دیارە (العز بن عبدالسلام) یەکێکە لەو زانایانەی کە ڕایان وایە وشەی بیدعەت چەمك و واتایەکەی فراوانەو هەموو پەیداگراو و داهێنراوێك دەگرێتەوە، چ چاك بێ چ خراپ، بۆیە ڕایان وایە کە (بیدعەت) پێنج حوکمە شەرعییەکانی بەسەردا دەچەسپێن، بەڵام وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە، ئەو ڕایە ڕاست نیەو، ڕاست ئەوەیە کە چەمك و واتای وشەی بیدعەت تایبەتییەو، بیدعەتیش چاکی تێدانیەو هەمووی خراپە، وەك فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڕاشکاویی گوتوویانە.

کەواتە:

ئەو پێناسەیەی (سلطان العلماء) بۆ بیدعەت، کاتێك ڕاست دەردەچێ کە بڵێین:

مەبەست لە: (کردنی شتێك کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ نەبووبێ) هەر شتێکە کە لە هەردووك بواری عەقیدەو عیبادەتدا بێ، نەك تێکڕای بوارەکانی دین و ژین بەگشتی.

**٣- (الشاطبي)یش لە پێناسەی بیدعەتدا گوتوویەتی:**

(هي طريقة في الدين مُخْتَرعَةٌ تُضاهي الشرعية يُقصدُ بالسُّلوك عليها المبالغة في التَّعَبُّد لله)[2] .

---

[1] القواعد الكبرى، ج٢، ص٣٣٧.

[2] الإعتصام، ص ٥٠.

واتە: ڕێچکەیەکە لە دیندا دادەهێنرێ لەبەرانبەر ڕێبازی شەرعیی دایە، مەبەست لە گرتنەبەری زێدەڕۆیی کردنە لە پەرستنی خوادا.

**٤- (ابن باز)یش لەوبارەوە بەمجۆرە پرسیاری لێکراوەو وەڵامی داوەتەوە:**

**(السؤال: متى يُوصَفُ العَملُ بأنّه بدعة في الشرع المطَهَّر، وهل إطلاق البدعةِ يكون في أبواب العبادات فقط، أم يشمل العبادات و المعاملات؟!**

**الجواب: البدعة في الشرع المطهَّر هي كل عبادة أحدثَها الناسُ ليس لها أصلٌ في الكتاب و لا في السنة لقول النَّبي ﷺ: ((مَنْ أحدثَ في أمرِنا هذا ما ليس منهُ فهوَ ردٌّ)) وتطلق البدعة في اللغة العربية على كل مُحدَثٍ على غير مثال سابقٍ، لكن لايتعلق بها حكم الـمَنْع إذا لَمْ تكُنْ منَ البِدَعِ في الدين، أمّا في المعاملات فما وافق الشرع منها فهوَ عَقدٌ شرعيّ و ماخالفَه فهوَ عقدٌ باطلٌ، ولايُسمَّى بدعة في الشرع لأنّه ليسَ من العبادة)**[1].

واتە: پرسیار: چ کاتێك لە شەریعەتی پاکدا کردەوەیەك بە بیدعەت دادەنرێ، وە ئایا وشەی بیدعەت تەنیا لەبواری عیبادەتدا بەکاردێ، یان گشتگیرە بۆ خوا پەرستییەکان و هەڵسوکەوتەکان ؟!

وەڵام: بیدعەت لە شەریعەتی پاکدا: بریتیە لە هەر جۆرە خواپەرستییەك کە خەڵك پەیدای دەکەن و بنەمایەکی لە کتێب و لە سوننەتدا نیە، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: ((هەرکەسێك لەم دینەماندا شتێك دابێنێ کە پێی نامۆ بێ، ئەوە ڕەتکراوەیە)).

وە وشەی بیدعەت لە زمانی عەرەبید بۆ هەر داهێنراوێکی بێ پێشینە بەکاردێ، بەڵام ئەگەر لەبواری دینداریی (خواپەرستیی)دا نەبوو، حوکمی

[1] فتاوى علماء البَلدِ الحرام، ص ٩٨٣.

ڕێلێگیران نایگرێتەوە، بەڵام لەبواری هەڵس و کەوتەکاندا هەرشتێك بەپێی شەرع بێ، ئەوە گرێبەستێکی شەرعییە، وە هەرشتێك پێچەوانەی شەرع بێ، گرێبەستێکی بەتاڵە، بەڵام لە شەرعدا پێی ناگوترێ بیدعەت، چونکە لەبواری عیبادەتدا نیە.

**٥- (ابن عثیمین)یش لەوبارەوە گوتوویەتی:**

(البدعة شرعاً ضابطُها: التعبُّد لله بما لم يُشَرِّعْهُ الله، و إن شئت فقل: التعبُّد لله تعالى بما ليس عليه النبي ﷺ ولا خلفاؤه الراشدون، فالتعريف الأول مأخوذٌ من قوله تعالى: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾ ﴾ الشورى، والتعريف الثاني مأخوذٌ من قول النبي ﷺ: ((عليكم بسُنَّتي و سُنَّة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي تمسَّكوا بها و عَضُّوا عليها بالنواجد، وإياكم و مُحْدثات الأمور...))، فكل مَنْ تعبّد لله بشيء لم يُشَرِّعْهُ الله، أو بشيء لم يكن عليه النبي و خلفاؤه الراشدون، فهو مُبْتَدِع سواء كان ذلك التعبُّد فيما يتعلّق بأسماء الله و صفاته أو فيما يتعلّق بأحكامه و شرعه، أمّا الأمور العادية التي تتبع العادة و العرف، فهذه لاتسمّى بدعة في الدين، و إن كانت تسمّى بدعة في اللغة)[1].

واتە: بیدعەت لە زاراوەی شەرعدا پێناسەکەی: پەرستنی خوایە بە شتێك کە خوا داینەنابێ، دەشتوانی بڵێی: پەرستنی خوای بەرز بە شتێك و بەشێوەیەك کە پێغەمبەر ﷺ و جێنشینە سەرڕاستەکانی لەسەری نەبووبن.

جا هەرچی پێناسەی یەکەمە ئەوە لە فەرموودەی خوای بەرز وەرگیراوە کە

[1] فتاوى علماء البلد الحرام، ص٩٨٦.

فەرموویەتی: ((یان ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن کە بەرنامەیەکیان لە ئایین بۆ داناون کە خوا مۆڵەتی لەسەر نیە؟!)) الشوری-٢١-، وە پێناسەی دووەم لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە، کە فەرموویەتی: ((ڕێبازی منو ڕێبازی جێنشینە سەرڕاستە ڕێنمایی کراوەکانی دوای من بگرن، توند دەستی پێبگرنو ددانانی لەسەر ڕۆبگرن، وە خۆتان لە شتی پەیداکراو دوور بگرن...)).

کەواتە: هەر کەسێك بەشتێك بەندایەتیی بۆ خوا بکات کە خوا داینەنابێ، یان بە شتێك کە پێغەمبەرو جێنشینە سەرڕاستەکانی لەسەری نەبووبن، ئەوە بیدعەتچییە، ئنجا یەکسانە ئەو پەرستنە پەیوەست بێ بە ناو و سیفەتەکانی خواوە، یان پەیوەست بێ بە بەرنامەکەیو یاساکانییەوە.

بەڵام کاروباری ئاسایی کە شوێن عادەتو باو دەکەون، ئەوە بە بیدعەت ناونابرێن، هەرچەندە لەڕووی زمانەوانیشەوە بە بیدعەت ناونابرێن.

دیارە ئەوەی لە کۆی ئەو پێناسانەی زاناو پێشەوایانی ئیسلامەوە بۆ بیدعەت دەستگیردەبێ ئەوەیە کە:

{بیدعەت تایبەتە بەبواری عیبادەتەوە، واتە: بەبواری مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ خوای بەرزو بێ وێنەدا، چ مامەڵەی فیکریی، چ مامەڵەی کردەیی، واتە: چ لەبواری ئیمانو عەقیدەدا، کە بێگومان ئیمانو عەقیدە بناغەی خواپەرستییو بەندایەتیی کردنە بۆ خوا، وە چ لەبواری دروشمەکان (شعائر)دا، وە بیدعەت هیچ پەیوەندیی بەبواری هەڵسو کەوتو عادەتەکانەوە نیە، کە بواری مامەڵەو هەڵسو کەوتی مرۆڤەکانە لە بەینی خۆیاندا}.

**ئنجا لێرەدا ڕەنگە یەکێك بپرسێ:**

ئەدی چی لە قسەی ئەو زانایانە دەکەی کە گوتوویانە: بیدعەت دوو جۆرە:

١- بیدعەتی باش (البدعة الحسنة).

٢- بیدعەتی خراپ (البدعة السَّیئة).

وە چی لە قسەی ئەو زانایانە دەگەی کە گوتوویانە: بیدعەت پێنج حوکمە شەرعییەکان (الأحكام الشرعية الخمسة)ی بەسەردا دەچەسپن؟!

واتە: وێڕای بیدعەتی حەڕام‌و ناپەسند (مکروه)، بیدعەتی ڕەوا (مباح) و پێویست (واجب)و پەسند (مُستحَبّ)یش هەیە؟!

وە زانایانی وەك:

(النَّووي) و (ابن حَجَر العَسقلاني) و (العز بن عبدالسلام) و (ابن حَجَر الهَیْتَمي)یشیان لەنێودا هەن؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

مادام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**أمَّا بَعدُ، فَإنَّ خيرَ الحديث كتاب الله و خَيرَ الهَدْيِ هَدْيُ محمدٍ ﷺو شرَّ الأمورِ مُحْدَثاتُها، وكلَّ بِدعةٍ ضَلالَة**) رواه مسلم: ٨٦٧، عن جابر بن عبدالله رضي الله عنهما.

واتە: پاش ستایشی خوا، بێگومان چاکترین قسە کتێبی خوایە، وە باشترین ڕێباز ڕێبازی موحەممەدە ﷺ، وە خراپترین شت پەیداکراوانن، وە هەموو داهێنراوێك (لەدینداریی) گومڕاییە.

هەروەها مادام فەرموویەتی: (**مَنْ أحدَثَ في أمرنا هذا ما ليسَ منه فهوَ رَدٌّ**) رواه البخاري: ٢٦٩٧، ومسلم:١٧١٨، واتە: هەر کەس شتێك لەم کارەی ئێمەدا پەیدابکات کە لەو نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە.

هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليه أمرُنا فهوَ رَدٌّ) رواه مسلم:١٧١٨، واتە: هەر کەسێك کردەوەیەك بکات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە.

کە هیچ گومانی تێدا نیە مەبەست لە (أمرنا هذا) و (أمْرُنا) لایەنی دینداریی و خواپەرستیی مسوڵمانەیێتیە، بەهەردووك جۆری ئیمان و عەقیدەو دروشمەکانەوە، چونکە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لەو دوو بوارەدا خاڵیان خستوونە سەر پیتان (وضعا النقاط على الحروف)، وە هەر شتێك لەو دوو بوارەدا دابهێنرێ، زیادەیەو ناپێویستەو ڕەتکراوەیە.

بەڵێ، ئنجا مادام پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕوون و ڕاشکاویی ڕایگەیاندوە کە هەموو پەیداکراو و داهێنراوێك "لەبواری دینداریدا بە مانا تایبەتییەکەی" گومڕایی و ڕەتکراوەیە، بگرە خراپترین شتە: (وشرَّ الأمور مُحدثَاتها)، کەواتە: هەرچییەك پێناسەی بیدعەت بیگرێتەوە، خراپ و گومڕایی و ڕەتکراوەیە.

بەڵام ئەدی بۆچی هەندێك لەزانایان پێیان وایە بیدعەتی چاك و خراپ هەیە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کە:

ئەو زانایانە چەمك و واتای (بِدْعة)یان زۆر فراوان کردوە، کە هەرچی شتی داهێنراو و پەیداکراوە جێگای تێدابۆتەوە، چ لەبواری خواپەرستییدا بێ، چ لەبواری هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا، واتە:

ئەوان وشەی (بدعة)یان بەمانا زمانەوانییەکەی (بمعناها اللُّغوي) بەکارهێناوە، کە وشەی (بدعة) بەمانا زمانەوانییەکەی و لەئەسڵی زماندا، بەهەر جۆرە داهێنراو و پەیداکراوێك دەگوترێ، چ لەبواری خواپەرستییدا بێ، چ لەبواری هەڵس و کەوت و عادەتدا، هەر بۆیەش زانایەکی وەك (العز بن عبدالسَّلام) کاتێك باسی جۆرەکانی بیدعەت دەکات و، بۆ پێنج جۆریان دابەش دەکات، چوار وێنە بۆ بیدعەتی پێویست (البِدَع الواجبة) دێنێتەوە، کە هیچ

پەیوەندییان بە بیدعەتەوە نیە، بەو پێناسەیەی کە لە زانایانەوە هێنامان، چونکە ئەو دەڵێ:

(وللبدَع الواجبة أمثلة:

أحَدُها: الإشتغال بعلم النَّحو، الذي يُفهَم بهِ كلامُ الله و كلامُ رسوله ﷺ.

المثال الثاني: حفظ غريب الكتاب و السُنَّة من اللغة.

المثال الثالث: تدوين أصول الفقه.

المثال الرابع: الكلام في الجرح و التعديل لتمييز الصَّحيح من السَّقيم.)[1]

وەك دەبینین، فێربوونی هەرکام لە زانستەکانی:

١- ڕێزمانی عەرەبیی.

٢- وشە نامۆکانی قورئان و سوننەت.

٣- نووسینەوەو دانانی (أصول الفقه).

٤-باسی حاڵی ڕاوییەکانی دەقەکانی سوننەت، لەڕووی متمانە پێکران و پێنەکرانیانەوە.

بەبیدعەتی پێویست دەزانێ، لەحاڵێکدا کە ئەمانەو هاووێنەکانیان دەچنە بازنەی بەرژەوەندییە ڕەهایەکان (المصالح المرسلة)ەوەو، هیچ پەیوەندییان بە بیدعەتەوە نیە، چونکە هیچ کامیان پەیوەندییان بە مامەڵەکردن لەگەڵ خوادا نیەو، لەبواری عەقیدەو عیبادەتدا نین.

ئنجا هەرچەندە لەڕووی زمانەوە سەرجەم داهێنراو و پەیداکراوەکان بە بیدعەت دادەنرێن، بەڵام ئەوەی ڕێمان لێدەگرێ کە چەمك و واتای بیدعەت لەسەر بناغەی واتا زمانییەکەی هێندە فراوان بکەین، کە هەموو پەیداکراو و

[1] القواعد الكبرى: الموسوم ب(قواعد الأحكام في مصالح الأنام، ج٢، ص٣٣٧.

داهێنراوەکان بگرێتەوە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێکڕای داهێنراو و پەیداکراوەکان (کل البدع و المحدثات)ی بە خراپترین شت و بە گومڕایی داناون (وشَرَّ الأمور مُحْدَثاتها و كلّ بدعة ضلالة)، ئاشکراشە کە داهێنراو و پەیداکراوەکانی بواری هەڵس و کەوتەکان، هەموویان خراپ و گومڕایی نین و چاك و خراپیان تێدایە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ داهێنان و پەیداکردنی خراپ و ناشەرعیی، بە بەند (قید)ی (أمرنا هذا) و (أمرنا)ەوە بەستۆتەوە، کە وەك گوتمان مەبەست پێی بواری دینداریی تایبەتە کە عەقیدەو خواپەرستییە.

ئێستاش زۆرباش ڕوونبۆوە کە بیدعەت هیچ پەیوەندیی بە بواری هەڵس و کەوت و نەریتەکانەوە نیەو، تەنیا لەبازنەی عەقیدەو عیبادەتدایەو، هەر بۆیەش بیدعەت هەمووی خراپەو هەمووی هەر گومڕاییە، چونکە لە هەردووك بواری ئیمان و عەقیدەو دروشمەکاندا، کە دەتوانین بە وشەی: خواپەستیی فیکریی و کردەیی، تەعبیری لێبکەین، خواو پێغەمبەری خوا خاڵیان خستۆتە سەر پیتان و، هیچ بواری پەیداکردن و داهێنانیان تێدا نیە، بۆیە هەر شتێك لەو دوو بوارەدا پەیدابکرێ و دابهێنرێ، بە زیادەو خراپ و گومڕایی دادەنرێ.

بەڵام بواری هەڵس و کەوتەکان و عادەتەکان، کە سەرجەم لایەنەکانی حوکم و سیاسەت و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتیی دەگرنەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە مەودای عەقڵ و ئەزموونی مرۆڤدان، شەریعەت نەچۆتە نێو وردەکارییەکانیان و بە دانانی چوارچێوەیەکی فراوان و، چەند بنەمایەکی سەرەکیی لێیان گەڕاوە، بۆیە بواری زۆر هەیە بۆ داهێنان و پەیداکردن تێیانداو، سەنگی مەحەکیش لەو بوارەدا هێنانەدی بەرژەوەندیی

(تحقيق المصلحة)یە.

ئنجا پێشتریش خستمانەڕوو کە یادو بۆنەو جەژنەکان لە بازنەو خانەی هەڵس و کەوت و نەریتەکاندان، کەواتە: یادو بۆنەو جەژنەکان هیچ پەیوەندییان بە بیدعەتەوە نیە، مەگەر کەسێك بە نەزانیی، یەکێك لەو بۆنانە بە جۆرێك لە خواپەرستیی دابنێ، ئەوکاتە دەڵێین:

ئەو کارو ڕەفتارەی بەپێی گومان و تێگەیشتنی هەڵەی خۆی، بە بیدعەت دادەنرێ، هەرچەندە لەبنەڕەتیشدا وانیە.

# بنەمای دەیەم:
# هەركات حوكمێكی شەرعیی
# لەسەر بناغەی عورف و عادەتێك بنیات نرا،
# بە گۆڕانی عورف وعادەتەكە ئەو حوكمەش دەگۆڕێ



ئەم بنەمایەش یەکێکە لەو بنەما شەرعییانەی کە تێکڕای زانایانی ڕۆچوو بە زانستدا لەسەری پێکهاتوون و، چاك لێتێگەیشتنی و پێوە پابەندبوونیشی، کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە واقیعیی بوونی مسوڵمانان و، بەجێ نەمانی دینیان لە ژینیان.

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان بەمجۆرە تەعبیریان لەم بنەمایە کردوە: (لايُنكَرُ تغيُّر الأحكام بتغيُّر الأزمان) واتە: نکوولّیی ناکرێ لە گۆڕانی حوکمەکان بەهۆی گۆڕانی ڕۆژگارەکانەوە.

زانایەکیش کە زۆر گرنگیی و بایەخی بەم بنەما شەرعییە داوەو، هەوڵی ڕوونکردنەوەو جێگیرکردنی داوە، لە عەقڵی مسوڵماناندا بەگشتی و زانایانیاندا بەتایبەت، بریتیە لە (القرافي)، بۆ وێنە لەوبارەوە گوتوویەتی:

**(انَّ إجراء الأحكام التي مدركها العوائد مع تغيّر تلك العوائد، خِلاف الإجماع و جهالة في الدين، بل كل ما هو في الشريعة يَتْبَعُ العوائدَ، يَتَغيّر الحكم فيه عند تغيُّر العادة إلى ماتقتضيه العادة المتجدِّدة، وليس هذا تجديداً لاجتهادٍ من المقلِّدين، حتى يُشتَرَط فيه أهلية الإجتهاد، بل هذه قاعدة إجتهد فيها العُلماءُ و أجمعوا عليها، فنحن نَتْبَعهُم فيها من دون استئناف اجتهادٍ...)**[1]

واتە: بێگومان جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەی کە لەسەر بناغەی عادەت و باوەکان دامەزراون، لەکاتی گۆڕانی عادەت و باوەکاندا، پێچەوانەی یەکدەنگیی (زانایان)و نەزانییە لە ئاییندا، چونکە سەرجەم یاساکانی شەریعەت، کە شوێن عورف و عادەتەکان دەکەون، لەکاتی گۆڕانی عورف و عادەتەکەدا، دەگۆڕێن بەرەو ئەوەی کە عادەت و باوە تازەکە دەیخوازێ.

---

[1] (الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام، وتصرفات القاضي و الإمام) ص٢١٨،٢١٩.

وە ئەمەش کۆشش (إجتهاد)ێکی تازەی لاساییکەرەوان (مقلدین)، نیە تاکو پەکی لەسەر شایستەیی کۆششکردن (أهلیة الإجتهاد) بکەوێ و تێیدا بەمەرج بگیرێ، بەڵکو ئەوە بنچینەیەکە زانایان ئیجتیهادیان تێداکردوەو لەسەری ڕێککەوتوون و، ئێمەش لەوەدا شوێنیان دەکەوین، بێئەوەی ئیجتیهادی تازەی بۆ بکەین.

پاشان (القرافي) هەر لەوبارەوە دەڵێ:

**(وكذلك الإطلاق في الوصايا و الأَيْمان و جميع أبواب الفقه المحمولة على العوائدِ، إذا تَغَيَّرت العادة تَغيَّرتِ الأحكام في تلك الأبواب، وكذلك الدَّعاوى إذا كان القولُ قول من ادّعى شيئاً لأنه العادة، ثم تَغيَّرت العادة، لم يَبْقَ القولُ قولَ مُدَّعيه بل انعكس الحال فيه)**[1].

واتە: هەروەها هەمان بنەما لە وەصیەتەکان و سوێندخواردنەکان و تێکڕای بوارەکانی شەرعدا، کەلەسەر بناغەی عادەت و باوەکان دامەزراون، هەرکات عادەتەکە گۆڕا، یاسا شەرعییەکانی ئەو بوارانەش دەگۆڕێن، وە هەروەها دەعوایەکان ئەگەر بەگوێرەی عورف و عادەت، قسە قسەی دەعواکەری شتێك بووبێ، پاشان عورف و عادەتەکە گۆڕا، ئەوکاتە قسە قسەی دەعواکەر نامێنێ، بەڵکو حاڵەتەکەی تێدا پێچەوانە دەبێتەوە.

شایانی باسیشە ئێمە لە بەشی سێیەمی ئەم باسەدا کە تایبەتمان کردوە بە قسەکردنەوە لەبارەی بۆنەی نەورۆز، باسی چۆنیەتی چەسپاندن (تطبیق)ی ئەم بنەما شەرعییە دەکەین، بەسەر بۆنەی نەورۆزو هەر بۆنەیەکی دیکەشدا، کە ڕەنگە کاتی خۆی بەشێوەیەك داهێنرابێ و حوکمێکی بووبێ، بەڵام پاش

[1] هەمان سەرچاوە، ص٢١٩.

گـۆڕانی ئـەو هـەل‌و مـەرج و عـادەت‌و بـاوەی ئەوکاتـەو، پەیـدابوونی عـادەت‌و باوێکی دیکەو، هەل‌و مەرجێکی دیکەی جیاواز لـە هـی ئەوکاتـە، حوکمەکەشی دەگـۆڕێ، وە وەك (القـرافي) گوتوویـەتی: "کـە زانایـەکی نـاوداری مـالیکیی مەزهەبـە" ئــەم بنەمایــە زانایــان لەســەری یەکــدەنگن‌و ڕێککــەوتوون‌و پێچەوانەکەیشی نیشانەی نەشارەزایی‌و بێ ئاگاییە لە دین!

# ئەنجامگیریی:

بەڕێزان!

ئێستا پاش خستنە ڕووی ئەو دە (١٠) بنەما گەورەو گرنگە، دەتوانین بڵێین:

جەژن و یادو بۆنەکان بەگشتی و بە هەرسێك جۆرەکانی: ١- ئایینی و، ٢- نیشتیمانیی و نەتەوەیی و، ٣- جیهانییەوە، لە خانەو بازنەی هەڵس و کەوت و عادەتەکاندان، کە بناغە تێیاندا ڕێپێدران و ڕەواییە، مەگەر شتێك بەڵگەیەکی شەرعیی ڕوون و بێ چەندو چوونی لەسەربێ و قەدەغەی کردبێ.

وە سەنگی مەحەك لەبواری هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا، بریتییە لە هێنانەدی بەرژەوەندیی (تحقيق المَصلحة) کە ئەویش، یان هێنانەدی سوودەکانە، یان لاچوونی زیانەکان (جَلبُ المنافع أو دفع المضار) یان هەردووکیانە وێکڕا، بۆیە لەبواری جەژن و بۆنەکاندا سەرنج دەدەین:

## ١- بۆ جەژن وبۆنە ئایینیەکان:

ئەگەر بەجۆرێك بوون کە لە چوارچێوەی شەریعەتدا بوون و ئامانجە شەرعییەکانیان پێ دەهاتنەدی، وەك: ١- زیاتر دامەزراندنی ئیمان، ٢- یادی خوا کردن، ٣- شارەزابوون لە قورئان، ٤- زیاتر ئاشنا بوون بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ٥- بەرپەرچدانەوەی گومان و تۆمەتەکان، ٦- ڕەواج پێدانی یاساکانی شەریعەت و ڕەوشت و بەها بەرزەکان، ٧- هاندانی مسوڵمانان بۆ دینداریی چاکترو پابەندیی زیاترو...هتد.

## ٢- بۆ جەژن وبۆنە نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان:

ئەگەر لە خودی خۆیاندا ناشەرعیی نەبوون و دەشبوونە مایەی:

١- یادکردنەوەی چاکەو نیعمەتەکانی خوا، ٢- دەرس و پەندوەرگرتن لە مێژوو و ڕابردوو، ٣- داکۆکییکردن لە مافە ڕەوایەکان، ٤- شارەزایی و بەرچاو ڕوونبوونەوە بەنسبەت ڕووداو و کارەساتێك، ٥- بەهێزکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان، ٦- بەرگرییکردن لە نیشتیمان و نەتەوە..هتد.

## ٣- بۆ جەژن وبۆنە جیهانییەکان:

ئەگەر لەخودی خۆیاندا ڕەوابوون و دەشبوونە هۆکاری:

١- بەرگریی کردن لە بەها بەرزەکانی وەك: دادگەریی، ئازادیی، یەکسانیی، ڕێزو حورمەتی مرۆڤ، بەزەیی و سۆز...

٢- لەسەرکردنەوەی توێژێکی دیاریکراو و دابین کردنی مافەکانی، بۆ نموونە: دایکان، مندالان، کەمئەندامان، زیندانییان، ڕۆژنامە نووسان، بەساڵداچوان...

٣- گرنگیی و بایەخدان بە بابەتێك کە بەرژەوەندیی گشتی تێدایە، وەك: ئاشتیی و تەبایی، پاراستنی ژینگە، بنبڕکردنی مادده سڕکەرەکان، بنبڕکردنی جگەرەکێشان...

٤- بەیەك ئاشنابوون و یەکدی ناسین، لەسەر ئاستی نەتەوەو کۆمەلگایەکان...

بەڵێ، هەرکات بۆنەو جەژن و یادە ئایینیی و نەتەوەیی و نیشتیمانیی و جیهانییەکان، بەو جۆرە بوون کە ئاماژەمان پێیان کردو، چەند نموونەیەکمان لێ خستنە بەرچاو، واتە:

بەجۆرێك بوون كە ئامانجە شەرعییەكانیان دەهێنایە دی، ئەوە وەك زانایان گوتوویانــە: بەرژەوەنــدیی لــە كــوێ بــێ، شــەریعەتیش لەوێیــە (أینمـا وجـدت المصـلحة فـثمَّ شـرع الله)، وە بــە شــەرعیی‌و ڕەوا دەدەنــرێن، چـونكە سـەنگی مەحەك لەبواری هەڵس‌و كەوت‌و عادەتەكاندا هێنانەدی بەرژەوەندییە.

بەڵام ئەگەر وانەبوون، ئەوە حوكمەكەیان دەگۆڕێ‌و، بـەگوێرەی نێـوەڕۆك‌و جەوهەرەكەیان حوكمیان دیاریی دەكرێ.

شایانی باسیشە ئەوەی لێرەدا گوتمان، سەرجەم جەژن‌و بۆنەكان دەگرێتـەوە بـە نەورۆزیشـەوە، بـەڵام لەبەرئـەوەی جـەژن‌و بۆنـەی نـەورۆز مشـت‌و مـڕی زیاتری لەبارەوە كراوەو دەكرێ، بەباشم زانی بەشی سـێیەمی ئـەم كتێبـەی بـۆ تەرخان بكەین‌و تیشكی زیاتری بخەینەسەر.

# بەشی دووەم

# هەڵسەنگاندنو لەبێژینگدانی بەڵگەو قسەکانی ئەوانەی سەرجەم یادو بۆنەکان بە حەڕام دەزانن، بێجگە لەهەردوو جەژنی ڕەمەزانو قوربانو ڕۆژی جومعە.

بەڕێزان !

لەم بەشی دووەمەدا سەرنجی قسەو بەڵگەکانی هەندێك لەو زانایانە دەدەین، کە پێیان وایە دروست نیە مسوڵمانان جگە لە دوو جەژنەکان (عيد الفِطْر و عيد النَّحر)و ئەو ڕۆژانەی دیکە کە دەقیان لەسەرە، دروست نیە بەشداریی هیچ یادو بۆنەو جەژنێکی دیکە بکەن، چ ئایینی بن چ دنیایی.

پاش سەرنجدانیشم لە قسەکانی ئەو جۆرە زانایانە، بۆم دەرکەوت کە ئەوانە بەگشتی سێ جۆرە بەڵگان دێننەوە، بۆ ئیسپاتی ناڕەوابوونی یادو بۆنەکان بەگشتی، جگە لەوانەی دەقیان لەسەر هاتوە، کە وەك دوایی لە (إبن عُثَيْمِين)ەوە دەیهێنین، دەڵێ: تەنیا جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانیی سەربڕین و ڕۆژی جومعەن- ئەو سێ جۆرە بەڵگانەش ئەمانەن:

**بەڵگەی یەکەم:** خستنە ڕووی قسەو بەڵگەکانیان.

**بەڵگەی دووەم:** ئەنجامدانی ئەو یادو بۆنانە خۆ پێچواندنی کافرانە (التشبُّه بالكفّار).

**بەڵگەی سێیەم:** کارو ڕەفتارو قسەی ناشەرعییان تێدادەکرێ.

## بەڵگەی یەکەم: خستنە ڕووی قسەو بەڵگەکانیان.

ئێستاش با سەرنجی چەند قسەیەکی هەرکام لە (عبدالله بن عبدالعزیز بن باز) و (إبن عثیمین) خوا لێیان خۆش بێ، بدەین، کە هەردووکیان ڕایان وایە بێجگە لە دوو جەژنەکان و ڕۆژی جومعە، دروست نیە مسوڵمانان لە هیچ بۆنەو یادێکی دیکەی ئایینی و دنیاییدا بەشداربن.

جا ئێمە سەرەتا قسەکانی ئەوان وەك خۆیان دێنین و، پاشان بۆیان دەگەڕێینەوەو هەڵیان دەسەنگێنین:

**یەکەم:** (ابن باز) وەك لە (فتاوی علماء البلد الحرام)دا هاتوە، ئەم پرسیارەی لێکراوە: (أَحْدَثَ بَعْضُ المشَايخ احتفَالات لا أعرف لَهَا وَجهاً في الشَّرع، كَالإحتِفَال بِمَولد النَّبِيّ ﷺ وبلَيلَة الإِسرَاءِ والمِعرَاج والهجرة النبوية، نرجو أن توضّحوا لَنَا مَا دَلَّ عَلَيْهِ الشرع في هَذِهِ الْمَسَائِل حَتَّى نَكُونَ عَلَى بَيِّنَةٍ؟) واتە: هەندێ لە زانایان هەندێ ئاهەنگیان داهێناون، کە هیچ ڕوویەکیان لە شەرعدا نیە، وەك ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺو، شەوی شەوڕۆ و بەرزبوونەوەو، کۆچی پێغەمبەر ﷺ، ئومێدمان وایە ئەوەمان بۆ ڕوون بکەنەوە، ئەوەی کە شەرع دەلالەتی لەسەر دەکات، لەو مەسەلانەدا، تاکو ئێمە بەرچاومان ڕۆشن بێ.

ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ: (لا رَيْبَ أنَّ اللَّه سُبْحَانَهُ قَد أكمل لهذِهِ الأمَّة دينَها وأتَمَّ عليها النعمة، كَمَا قَالَ سُبْحَانَه: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾المائدة، الآية. وقد توفَّى الله نبيَّه ﷺ بعد ما بلَّغ البلاغ المبين وأكمل الله به شرائع الدين، وقال ﷺ {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ} مُتَّفَقٌ عَلَى صحَّتِهِ مِن حديث

عائشة رضي اللَّهُ عنها. وأخرج مسلم في صحيحه عنها رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال: {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرنَا فَهُوَ رَدٌّ} وَمَعنى قوله: "فَهُوَ رَدٌّ أي: مردود لا يجوز العمل به لأنه زيادة في الدين لم يأذن الله بها، وقد أنكر الله سبحانه في كتابه المبين على من فعل ذلك، فقال عَزَّوَجَلَّ في سورة الشورى: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾﴾، وفي صحيح مسلم عن جابر رضي اللّه عنه أن النبي ﷺ كان يقول في خطبة الجمعة: أَمَّا بَعْدُ. فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ. وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ. وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ... وهذه الإحتفالات التي ذكرت في السؤال، لم يفعلها الرسول ﷺ وهو أنصح الناس وأعلمهم بشرع اللّه، وأحرصهم على هداية الأمة وإرشادها إلى ما ينفعها ويُرْضي مولاها سبحانه، ولم يفعلها أصحابه رضي اللّه عنهم وهم خير الناس وأعلمهم بعد الأنبياء، وأحرصهم على كل خير، ولم يفعلها أئمة الهدى في القرون المفضلة وإنما أحدثها بعض المتأخرين..)[1] واتە: بێطومان خوای ثاك دینی ئەم ئوممەتەی تەواو كردوە، وە نیعمەتی خۆی بە تەواویی بەسەردا ڕشتوون، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴿٣﴾﴾المائدة، واتە: ئەمڕۆ ئاینەكەتانم بۆ تەواو كردوون‌و چاكەی تەواوەتیم لەگەڵدا كردوون، وە ئیسلامیشم بە بەرنامە بۆ پەسند كردوون، پێغەمبەریش ﷺ كاتێك خوا بردیەوە كە بە تەواویی دینی ڕاگەیاند، وە خوا بەرنامەكانی دینی پێ تەواوكردن، (بۆیە هیچ كەسێك بۆی

[1] - بڕوانە: (فتاوى علماء البلد الحرام) ص٩٩٣-٩٩٥.

نیە، لە دینی خوادا شتێك کە خوای پەروەردگار دایەناوە، دایبنێ)[1] وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی، {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٦٩٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥٨٩))، واتە: هەرکەس لەم ئاینەماندا شتێك دابێنێ کە لەوی نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە، وە فەرمویەتی: {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٥٩٠))، واتە: هەرکەسێك کردەوەیەك بکات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەوە ڕەتکراویە، ئنجا دەفەرموێ: (فَهُوَ رَدٌّ) واتە: ڕەتکراوەیەو دروست نیە کاری پێ بکرێ، چونکە زیادەیەکە لە دیندا کە خوا فەرمانی پێنەکردوە، یان مۆڵەتی لەسەر نیە، وە خوا "سبحانە و تعالى" لە کتێبی ڕوونی خۆیدا نکوولێی لەو کەسە کردوە کە ئەوە دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾الشوری، واتە: ئایا چەند هاوبەشێکیان هەن، شتێکیان لە دیندا بۆ داناون، کە خوا فەرمانی لەسەر نیەو مۆڵەتی پێ نەدراوە، وە لە (صحیح مسلم)دا هاتوە، کە جابیر دیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە وتاری ڕۆژی جومعەدا، دەیفەرموو: {أَمَّا بَعْدُ, فَإِنَّ خَيْرَ اَلْحَدِيثِ كِتَابُ اَللَّهِ, وَخَيْرَ اَلْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ, وَشَرَّ اَلْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٤٢))، واتە: پاش ستایشی خوا: باشترین فەرموودە کتێبی خوایەو، باشترین ڕێباز ڕێبازی موحەممەد پێغەمبەرە ﷺ، وە خراپترین کردەوەکان ئەوانەن کە پەیداکراون، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕایی یە.

[1] - ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست.

وە ئەو یادو بیرەوەرییانە، کە لە پرسیارەکەدا هاتوون، پێغەمبەر ﷺ نەیکردوون، کە لە هەموو کەس دڵسۆزتر بووە بۆ خەڵك، وە شارەزاتر بووە بە شەرعی خوا، وە سوورتر بووە، لەسەر هیدایەتی ئۆممەتو ڕێنموونی کردنی، بۆ شتێك کە سوودی پێ دەگەیەنێو خوای پەروەردگاری پێ ڕازی دەکات، وە هاوەڵە بەڕێزەکانیشی نەیانکردوون خوا لێیان ڕازی بێ، کە باشترین خەڵكو زاناترین خەڵك بوون لە دوای پێغەمبەر، وە پێشەوایانیش نەیانکردوون، لەسەدە پەسندکراوەکاندا، بەڵکو هەندێ لە زانایانی دوایین دایانهێناون.

هەروەها (ابن باز) لە وەڵامی پرسیارێکی دیکەدا دەڵێ: (**...ولم يشرع لنا سبحانه وتعالى عيداً للميلاد لا ميلاد النبي ﷺ ولا غيره، بل قد دلت الأدلة الشرعية من الكتاب والسنة على أن الإحتفال بالموالد من البدع المحدثة في الدين ومن التشبه بأعداء الله من اليهود والنصارى وغيرهم، ... وفي مسند أحمد بإسناد جيد عن ابن عمر رضي اللَّهُ عنهما أن النبي ﷺ قال: "مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ"، وفي الصحيحين عن أبي سعيد رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال: " لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ الذين منْ قَبْلِكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا في جُحْرَ ضَبٍّ لاتبعتموهم، قلنا يَا رَسُول اللَّهُ! اليَهُودُ وَالنَّصَارَى؟ قَالَ :"فمن؟"**)[1]، واتە: خوا "سبحانه و تعالى" بۆی دانەناوین، یادی لەدایك بوونی هیچ کام لە پێغەمبەران بکەین، نەهی پێغەمبەر (محمد) ﷺ، نە هی هیچ کەسێکی دیکە، بەڵکو بەڵگە شەرعییەکان لە قورئان و سوننەتدا دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، کە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لەدایك

---

[1] - فتاوى علماء البلد الحرام، ص٩٨٧،٩٨٨، فەرموودەکەش (بخاري) بەژمارە: ٧٣٢و (مسلم) بەژمارە: ٢٦٦٩ هێناویانە.

بوونەکانەوە، لە داهێنراوەکانن لە دیندا، وە لە خۆ وێچواندنن بە دوژمنانی خوا، لە جوولەکەکان و نەصڕانییەکان، وە غەیری ئەوانیش وەك، لە: (مسند أحمد)دا بەسەنەدێکی باش لە (ابن عمر)ەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ}، واتە: هەرکەسێك خۆی وەك قەومێك بچوێنێ، ئەوە لەوانە.

وەلەهەردووك (صحيح)ی (بخاري و مسلم)دا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دوای ڕێ‌و شوێنی ئەوانی پێش خۆتان دەکەون موو بەموو، بست بە بستو ، باسك بە باسك، هەتاکو ئەگەر چووبنە کونی بزن مژەیەکەوە، ئێوەش دوایان دەکەون، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ﷺ مەبەستت پێ جوولەکەو نەصڕانییەکانە؟ فەرمووی: ئەدی مەبەستم پێ کێیە؟

**دووەم**- (إبن عثيمين)یش ڕەحمەتی خوای لێ بێ، پرسیارێکی لێکراوە بەم شێوەیە:

(سئلعن حكم الإحتفال بالمولد النبوي؟ فأجاب قائلاً: أولاً : ليلة مولد الرسول، ﷺ ليست معلومة على الوجه القطعي، بل إن بعض العصريين حقق أنها ليلة التاسع من ربيع الأول وليست ليلة الثاني عشر منه، وحينئذ فجعل الإحتفال ليلة الثاني عشر منه لا أصل له من الناحية التاريخية.

ثانياً : من الناحية الشرعية فالإحتفال لا أصل له أيضاً لأنه لو كان من شرع الله لفعله النبي ﷺ أو بلَّغه لأمته ... وإذا لم يكن من دين الله فإنه لا يجوز لنا أن نتعبد به الله - عز وجل - ونتقرب به إليه ، فإذا كان الله تعالى قد وضع للوصول إليه طريقاً معيناً، وهو ما جاء به الرسول ﷺ فكيف يسوغ لنا ونحن عباد أن نأتي بطريق من عند

**أنفسنا يوصلنا إلى الله ؟ هذا من الجناية في حق الله - عز وجل- أن نشرع في دينه ما ليس منه، كما أنه يتضمن تكذيب قول الله - عز وجل-:** ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ﴿٣﴾﴾ المائدة،

فنقول: هذا الإحتفال إن كان من كمال الدين، فلا بد أن يكون موجوداً قبل موت الرسول ، ﷺ وإن لم يكن من كمال الدين، فإنه لا **يمكن أن يكون من الدين لأن الله - تعالى - يقول:** ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ﴿٣﴾﴾ المائدة، ومن زعم أنه من كمال الدين وقد حدث بعد الرسول ، ﷺ ، فإن قوله يتضمن تكذيب هذه الآية الكريمة، ولا ريب أن الذين يحتفلون بمولد الرسول ، ﷺ ، إنما يريدون بذلك تعظيم الرسول ،عليه الصلاة والسلام، وإظهار محبته وتنشيط الهمم على أن يوجد منهم عاطفة في ذلك الإحتفال للنبي ﷺ وكل هذا من العبادات ؛ محبة الرسول ﷺ ، عبادة، بل لا يتم الإيمان حتى يكون الرسول، ﷺ أحب إلى الإنسان من نفسه وولده ووالده والناس أجمعين ، وتعظيم الرسول ﷺ من العبادة، كذلك إلهاب العواطف نحو النبي ﷺ من الدين أيضاً، لما فيه من الميل إلى شريعته ، إذاً:

فالإحتفال بمولد النبي، ﷺ من أجل التقرب إلى الله وتعظيم رسوله ﷺ عبادة، وإذا كان عبادة فإنه لا يجوز أبداً أن يحدث في دين الله ماليس منه ، فالإحتفال بالمولد بدعة ومحرم)[1]، واتە: پرسیاری لێکرا دەربارەی حوکمی یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ؟ وەڵامی دایەوەو گوتی:

---

[1] - فتاوى علماء البلد الحرام، ص٩٩٧،٩٩٦.

**یەکەم:** شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بەشێوەیەکی جێی دڵنیایی زانراو نیە، بەڵکو هەندێك لەهاوچەرخان ساغیان کردۆتەوە کە شەوی نۆیەمی ڕەبیعی یەکەمە، نەك شەوی دوازدەیەمی، کەواتە: گێڕانی شەوی دوازدەیەمی بە کاتی یادکردنەوەو کردبوونەوە لەڕووی مێژووییەوە، هیچ بنەمایەکی نیە.

**دووەم:** وە لەڕووی شەرعییەوە دیسان ئەو کردبوونەوەو یادکردنەوەیە بنەمای نیە، چونکە ئەگەر لەشەریعەتی خوا بووایە پێغەمبەر دەیکرد، یان بەئۆممەتەکەی ڕادەگەیاند... ئنجا مادام لەئایینی خوا نەبێ، بۆمان نیە کە خوای زاڵو بەرزی پێ بپەرستینو بەهۆیەوە لێی نیزیك ببینەوە، چونکە مادام خوای بەرز بۆ پێگەیشتنی ڕێیەکی دیاریکراوی داناوە "کە بریتیە لەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی" چۆن ئێمەی بەندە بۆمان هەیە لەلایەن خۆمانەوە ڕێیەك بۆ گەیشتن بەخوا دابنێین؟ ئەوە تاوانە بەرانبەر بەمافی خوا "عز وجل" کە شتێك لەئایینی خوادا دابنێین کە لەو نەبێ.

هەروەها ئەوە بەدرۆ دانانی فەرمایشتی خواش دەگرێتە خۆی: ((ئەمڕۆ ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردوونو چاکەی خۆمم بەتەواویی لەگەڵ کردن)) المائدة -٣-.

**بۆیە دەڵێین:**

ئەو ئاهەنگ گێڕانو یادکردنەوەیە، ئەگەر لەتەواویی ئایین بوایە، دەبوو پێش مردنی پێغەمبەر ﷺ ببوایە، وەئەگەر لەتەواویی ئاینیش نەبێ، ناگونجێ بەشێك بێ لەئایین، چونکە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿...ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ...٣﴾ المائدة، هەرکەسێك پێی وابێ لەتەواویی ئایینەو پاش پێغەمبەریش پەیدابووە، ئەوە قسەکەی بەدرۆ دانانی ئەم ئایەتە بەڕێزە

دەگەیەنێ.

ئنجا بێگومان ئەوانەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ دەکەنەوە، مەبەستیان بەگەورە گرتنی پێغەمبەرو دەرخستنی خۆشویستنی‌و جووڵاندنی هیممەتیانە کە لەو یادکردنەوەیەدا سۆزیان بەرانبەر بەپێغەمبەر بجووڵێ، هەموو ئەوانەش لەخوا پەرستییەکانن، جا خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ عیبادەتە، بگرە ئیمان تەواو نابێ هەتا مرۆڤ پێغەمبەری لەخۆی‌و ڕۆڵەی‌و باب‌و دایکی‌و تێکڕای خەڵکی خۆشتر نەوێ، هەروەها بەگەورەگرتنی پێغەمبەر عیبادەتە، هەروەها سۆزو جووڵاندن بەرەو پێغەمبەر ﷺ دیسان لەئایینە، چونکە دەبێتە مایەی خۆشویستنی شەریعەتەکەی!

کەواتە:

یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ لەپێناو نیزیک کەوتنەوە لەخوادا، وە بەگەورە گرتنی پێغەمبەر عیبادەتە، ئنجا مادام عیبادەت بێ، ئەوە بێگومان هەرگیز دروست نیە شتێك لەئایینی خوادا پەیدا بکرێ کە لەو نیە، بۆیە یادکردنەوەی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ بیدعەت‌و حەڕامە.

ئنجا هەر (إبن عثيمين) بە بۆنەی (عيد الأم) جەژنی دایکەوە، پرسیاری لێکراوە: (ئایا ئێمە لە شوێنێکین، کە هەموو ساڵان لەو ڕۆژەدا، لە (٢١)ی مارسی هەر ساڵێك، هەموو خەڵك کۆدەبنەوە بەو بۆنەوە، ئنجا ئایا ئەوە حەڵاڵە یان حەڕام، وەئایا یاد بکەینەوەو دیاریی ببەخشینەوە، یان نا؟! ئەویش دەڵێ: (إن كل الأعياد التي تخالف الأعياد الشرعية كلها أعياد بدع حادثة لم تكن معروفة في عهد السلف الصالح، وربما يكون منشؤها من غير المسلمين أيضا؛ فيكون فيها مع البدعة مشابهة أعداء الله

سبحانه وتعالى ، والأعياد الشرعية معروفة عند أهل الإسلام ، وهي عيد الفطر ، وعيد الأضحى، وعيد الأسبوع (يوم الجمعة) وليس في الإسلام أعياد سوى هذه الأعياد الثلاثة ، وكل أعياد أحدثت سوى ذلك فإنها مردودة على محدثيها وباطلة في شريعة الله سبحانه وتعالى، لقول النبي ﷺ {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٦٩٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٥٨٩))، أي : مردود عليه غير مقبول عند الله وفي لفظ : {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ} (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٥٩٠))، وإذا تبين ذلك، فإنه لا يجوز في العيد الذي ذكر في السؤال والمسمى عيد الأم، لا يجوز فيه إحداث شيء من شعائر العيد ، كإظهار الفرح والسرور ، وتقديم الهدايا وما أشبه ذلك)[1] واتە: هەموو ئەو جەژنانەی کە پێچەوانەی جەژنە شەرعییەکانن، هەموویان جەژنی داهێنراون و پەیداکراون، وە لەسەردەمی پێشینی چاکماندا نەبوون، وە دەشگونجێ سەرچاوەی سەرهەڵدانیشیان غەیری مسوڵمانانیش بێ، بۆیە وێڕای بە بیدعەت لەقەڵەم درانیان، خۆپێچواندنی دوژمنانی خواشیان "سبحانه وتعالى" تێدایە، دیارە جەژنە شەرعییەکانیش لەلای ئەهلی ئیسلام زانراون، کە بریتین لە:

جەژنی ڕۆژوو شکاندن (عید الفطر)و، جەژنی قوربانیی سەربڕین (عید الأضحى)و، جەژنی هەفتە (ڕۆژی جومعە)، وە لە ئیسلامدا جگە لەم سێ جەژنە هیچ جەژنی دیکە نیە، وە سەرجەم ئەو جەژنانەی دیکە کە پەیداکراون، ئەوە بەسەر خاوەنە پەیداکەرەکانیاندا دەدرێنەوەو، لە شەریعەتی

[1] - هەمان سەرچاوە: ص١٠٥٢،

خوای پاكو بەرزدا بەتاڵن، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (مَنْ أحدثَ في أمرنا هذا ما ليسَ منه فهوَ ردٌّ) متفق عليه، واتە: ڕەتكراوەیەو لەلای خوا وەرگیراو نیە، وە لە ڕیوایەتێكدا: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليهِ أمرنا فهوَ ردٌّ) رواه مسلم.

ئنجا ئێستا كە ئەوە ڕوونبۆوە ئەوە بەدڵنیاییەوە لەو جەژنەدا كە پرسیاركەر باسیكردوەو ناوی ناوە: (جەژنی دایك) دروست نیە هیچ كام لەو شتانەی كە دروشمی جەژنن تێیدا ئەنجام بدرێن، وەك دەرخستنی خۆشیی‌و شادیی‌و پێشكەشكردنی دیاریی‌و وێنەی ئەوانە...

# هەڵسەنگاندنی ئەو قسەو بەڵگانە:

سەرەتا دەڵێم:

ئێمە رێزو حورمەتی هەموو زانایانی ئیسلاممان لەلایەو، هەرکام لە (إبن باز) و (إبن عثێمین)یش خوا لێیان خۆش بێ، لەبواری پسپۆریی خۆیانداو بە ئەندازەی بۆلوان و رێپێدرانیان، خزمەتیان کردوەو خوا پاداشتیان بداتەوەو، لە هەڵەو کەم و کوورپیی و، ئێمەش و ئەوانیش ببووریّ.

بەلام بێگومان وەك لە بنەمای یەکەم "لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا" گوتمان: ئیسلام لە قورئان و سونتەتدا کورت هەڵاتوەو، غەیری قورئان و سونتەت، هەمووی بە تێگەیشتنی زانایان لەبارەی ئیسلامەوە دادەنرێ، نەك بەخودی ئیسلام، وە هەموو مرۆڤەکانیش جگە لە پێغەمبەران "علیهم الصلاة والسلام" کە خوا پاراستوونی، دەگونجێ بەهەڵەدا بچن و نەیپێکن.

ئێستاش با سەرەتا هەرسێك بەڵگەکانی ئەو دوو زانا بەرێزەو هاورایەکانیان هەڵسەنگێنین، پاشان بەوردیی قسەکانیشیان بژار بکەین، لە دوو برگەی سەرەکییدا:

## برگەی یەکەم: هەڵوشاندنەوەی بەڵگەکانیان:

### بەڵگەی یەکەم: بە بیدعەت دانانی جەژن و بۆنەکان:

دیارە ئەم بەڵگەیە، بەلگەی بنەرەتیی ئەو دوو زانا بەرێزەو هاووێنەکانیانە، چونکە ئەو قسانەی کە لێیانەوە نەقڵمان کردن، بەزۆریی هەر

لـەو خولگەیـەدا دەسـووڕێینەوەو، بەلگـە پێهێنانـەوەی هـەردووکیان بـە ئایەتەکانی:

★﴿ ...ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي ...﴿٣﴾ ﴾ المائدة.

★ ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾ ﴾ الشورى.

وە فەرموودەکانی:

★ (مَنْ أحدث في أمرنا هذا ما ليسَ منه فهو ردّ) متفق عليه.

★ (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليهِ أمرنا فهوَ ردٌّ) رواة مسلم.

◆ (لَتتبعُنَّ سَنَن الذين من قبلكم شبْراً بشِبْرٍ و ذراعاً بِذراعٍ، حتى لو دخلوا في جُحْرِ ضَبٍّ لاتَّبعتموهم، قلنا يا رسول الله ! اليهود و النصارى؟ قال: فَمَنْ؟) رواه البخاري: ٧٣٢، ومسلم: ٢٦٦٩.

کە پێشتر مانامان کردوون، هەر لەسەر ئەو بناغەیە کە: مادام ئیسلام بەرنامەیەکی تێرو تەواوە، نابێ هیچ شتێکی تێدا زیاد بکرێ.

ئێمەش لەوەلامی ئەو قسەیەدا دەڵێین:

١- لەڕابردوودا "لەبنەمای نۆیەمدا" باسمان کردو ڕوونمان کردەوە، کە بیدعەت تایبەتە بە هەردووك بواری ئیمان و عەقیدەو عیبادەتەوە، وە تەنیا ئەو شتانە دەگونجێ بیدعەتیان تێدا دابهێنرێ، کە پەیوەندییان بەنێوان بەندەو خواوە هەیەو، بەندە بۆیە ئەنجامیان دەدات کە پێیان لەخوا نێزیك بکەوێتەوە، وەك (إبن باز) گوتوویەتی: (البدعة في الشرع المطهَّر هي كل عبادةٍ أحدثها الناسُ ليس لها أصلٌ في الكتاب و لا في السنة، لقول

النبي: مَنْ أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردٌّ...)[1] "کەپێشتریش هێنامان".

وە (إبن عثيمين)یش گوتوویەتی: (البدعة شرعاً ضابطُها : التعبُّد لله بما لم يُشَرِّعْهُ الله...)[2] کە ئەمیشمان پێشتر هێنا.

٢- هەروەها لە ڕابردوودا "لەبنەمای هەشتەمدا" ڕوونمان کردەوەو سەلماندیشمان کە یادو بۆنەو جەژنەکان چونکە لەچوارچێوەی هەڵس و کەوت و عادەتەکاندان و ئەوانیش بناغە تێیاندا ڕەواییە، مەگەر بەڵگەیەکی تایبەت هەبێ لەسەر قەدەغە بوونیان، بۆیە: یادو بۆنەو جەژنەکان، ناگونجێ لەبارەیانەوە باسی بیدعەت هەر بکرێ، چونکە بریتین لە مامەڵەی مرۆڤەکان لەنێو خۆیانداو، ڕاستەوخۆ بۆ خوا ئەنجام نادرێن، وەك عیبادەت و خۆ پێ نێزیك خستنەوە لە خوا.

٣- ئنجا بەدانپێداهێنانی (إبن باز)، فەرموودەکانی: (مَنْ أحدث في أمرنا هذا ما ليسَ منه فهو ردّ) وە: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليهِ أمرنا فهوَ ردٌ) مەبەست پێیان عیبادەتە: نەك بواری هەڵس و کەوتەکان، وەك لەو قسەیەوە دیارە کە تۆزێك لەمەوبەر لێیەوە هێنامان.

هەروەها بەدانپێداهێنانی (إبن عثيمين)یش ئایەتی: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾ ﴾ الشورى، مەبەست پێی

[1] فتاوى علماء البلد الحرام، ص٩٨٣.

[2] هەمان سەرچاوە، ص٩٨٦.

بـواری عیبادەتـە[1] ، چونکە پـاش پێناسـەی بیدعـەت، دەڵـێ: (فـالتعريف الأول مأخوذ من قوله تعالى:﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ ... ﴾).

٤- کەواتـە: جـەژن و بۆنـەکان لـە بابـەتی هـەڵس و کـەوت و عادەتـەکانن و لەبازنـەی ئەوانـدان و، هـیچ پەیوەنـدییان بـە عیبادەتـەوە نیـە، نـە لـەڕووە فیکرییەکەیـەوە، کـە ئیمـان و عەقیدەیـەو، نـە لـەڕووە کردەییەکەیـەوە، کـە لـە دروشمەکان (الشعائر)دا خۆی دەنوێنێ.

٥- مەبەستیش لە فەرموودەی: (لَتَتبعُنّ سَنَن[2] الذين من قبلكم شبْراً بشِبْرٍ و ذراعاً بذراعٍ...) شوێنکەوتنی جوولەکەو نەصرانییەکان و غەیرە دینـەکانی دیکەیە، لەو شتانەدا کە پێچەوانەی شـەریعەتن و لەگەڵیـدا تێـك دەگیرێـن، وەك لەوەڵامدانـەوەی بەڵگـەی دووەمـدا باسـی دەکـەین، کـە بێگومـان ئـەو بۆنـەو یـادەوەریی و جەژنـە ئـایینی و نەتـەوەیی و نیشـتیمانیی و جیهانییانـەی کـە لـە خـودی خۆیانـدا ناشـەرعیی و خـراپ نـین و، هۆکـارن بـۆ هێنانـەدی ئامانجـە شـەرعییەکان، ئەگـەر نـا مسـوڵمانانیش دایانهێنـابن، مـادام لـە تایبەتمەندییـە ئایینییەکانیان نین و، لەچوارچێوەی هـەڵس و کـەوت و نەریتـەکان (المعاملات و العـادات)دان، مسـوڵمانان دەسـتیان کراوەیـە بـۆ بـەکارهێنانیان وەك خـوای کاربـەجێ "عـز وجـل" فەرموویـەتی: ﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾

---

[1] بەڵام من پێم وایە چەمکی ئایەتەکە لەوە فراوانترە، بەڵام لێرەدا بـەپێی بنچینـەی: (أدينـك من فمك) ڕەفتارم کردوە.

[2] السَنَن، الطريقة و المثال، المعجم الوسيط، ص٤٥٦.

الزمر.

واتە: دەجا موژدە بدە بەو بەندانەم: کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، پاشان شوێن چاکترینی دەکەون، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، وە ئەوانەن خاوەن عەقڵان.

## بەڵگەی دووەم: ئەنجامدانی ئەو یادو بۆنانە، خۆ پێچواندنی کافران (التشبُه بالكفّار) ە:

هەڵبەتە ئەم قسەیەش کە: یادکردنەوەی ئەوبۆنەو جەژنانەی کە دەقی شەرعییان لەسەر نیە خۆپێچواندنی کافرانیان تێدایە، لەسەر ئەوە بنیات نراوە کە ئەو یادو بۆنانە عیبادەتنو، عیبادەتیش جگە لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە بیدعەتە، بۆیە بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو قسەیە لە وەڵامی بەڵگەی یەکەمدا، بناغەی ئەم بەڵگەی دووەمەش نەماوەو، بەڵگەکەش هەرەسی هێناوە.

بەڵام وێڕای ئەوەش دەڵێین:

زانایانی قوولّو موعتەبەر لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە خۆبەکافران چواندن (التشبُّه بالكُفّار) تەنیا لەو شتانەدا قەدەغەیە، کە تایبەتمەندیی ئایینیو فیکریی کافرانن، نەك لە هەموو شتێکدا، با لەوبارەوە سەرنجی چەند قسەیەکی هەرکام لە (إبن حجر العسقلاني) و (إبن عُثيْمين) بدەین:

١- (إبن حجر) گوتوویەتی: (**وقد كره بعضُ السَّلَفِ لُبْسَ البُرْنُسِ لأنه كان من لباس الرُّهبان، وقد سُئِلَ مالك عنه، فقال: لابأس به، قيل: فإنه**

**من لبوس النَّصارى، قال: كان يُلْبَسُ هَهُنا)**[1].

واتە: هەندێك لەپێشووان پێیان ناخۆش بووە بورنوس بپۆشرێ، چونکە پۆشاکی ڕاهیبەکان بووە، وە لەوبارەوە پرسیار لە مالیك کراوە، ئەویش گوتوویەتی: قەیناکات، گوترا: ئەوە پۆشاکی نەصرانییەکانە، گوتی: لەم دەڤەرە دەپۆشرا.

واتە: مادام خەڵکی مسوڵمانیش ئەو پۆشاکەی پۆشیبێ، کەواتە: لەوە شۆڕاوە کە لە تایبەتمەندییە ئایینییەکانیان دابنرێ و، ئاساییە کە بپۆشرێ.[2]

هەروەها (إبن حجر) گوتوویەتی: **(و انْ قلنا: النهي عنها (أي المياثر الأرجوان) من أجل التشبُّه بالأعاجم فهو لمصلحة دينيةٍ، لكن كان ذلك شعارهم حينئذٍ و هم كُفار، ثم لمّا لم يصر الآن يَختصُّ بشعارهم، زال ذلك المعنى، فتزول الكراهة)**[3].

واتە: ئنجا ئەگەر گوتمان: قەدەغەکرانی (واتە: پۆشاکی ڕەنگکراو بەسوور)[4] لەبەر خۆ وێچواندنی بێگانان (نامسوڵمانان) بووە، کەواتە: ئەوە لەبەر بەرژەوەندییەکی ئایینیە، بەڵام دیارە ئەو کاتە ئەو جۆرە بەرگە دروشمیان بووە، کە کافر بوون، بەڵام مادام ئێستا دروشمێکی تایبەت نیە بەوانەوە، ئەوە ئەو مانایە لاچووە و ناپەسندیی (کراهة)یەکەش نەماوە.

٢- (إبن عثيمين)یش لەوبارەوە ئەم پرسیارو وەڵامەی بووە:

(السؤال: عن معيار التشبُّه بالكفار ، ما هو؟

---

[1] فتح الباري: ج١، ص٢٧٢.

[2] البرنس: كل ثوب رأس منه ملتزق به، قلنسوة طويلة، لباسُ الحمام. المعجم الوسيط، ص٥٢ .

[3] الفتح الباري، ص ٣٠٧

[4] المياثر الأرجوان: جۆرە پۆشاکێکە....

الجواب: معيار التشبُّه أن يفعل المشتَبِّه مايَختصُّ المتشَبَّه به، فالتشبه بالكفار أن يفعل المسلم شيئاً من خصائصهم، أما ما انتشر بين المسلمين و صار لايتميز به الكفار، فإنه لايكون تشبُّهاً فلايكون حراماً من أجل أنه تشبُّه، الاّ أن يكون من جهةٍ أخرى).[1]

واتە: پرسیار لەبارەی پێوەری خۆ بە كافر چواندن، ئایا چییە؟!

وەڵام: پێوەری خۆ بە كافر چواندن ئەوەیە، كە بابای خۆپێچوێنەر شتێك بكات كە تایبەتە بە خۆ پێچوێنراو، كەواتە: خۆ بەكافران چواندن ئەوەیە كە مسوڵمان شتێك لە تایبەتمەندییەكانیان (تایبەتمەندییە ئایینییەكانیان) بكات، بەڵام ئەوەی كە لەنێو مسوڵماناندا بڵاوبۆتەوەو كافرانی پێ جیاناكرێتەوە، ئەوە بە خۆپێچواندن دانانرێ‌و، لەبەرئەوە قەدەغە نابێ كە خۆپێچواندنە، مەگەر لەلایەكی دیكەوە قەدەغە بێ.

كەواتە: فەرموودەی: (مَنْ تشبَّهَ بقومٍ فهوَ منهُم)رواه أحمد، مەبەستی پێی خۆپێچواندن‌و چاولێكردنی مسوڵمانانە بۆ كافران، لەو شتانەدا كە تایبەتمەندیی ئایینی ئەوانن‌و، دروشمێكیانن كە پێی دەناسرێن، نەك لەهەر شتێكدا، وەك لە (إبن حجر العسقلاني) و (إبن عثيمين)ەوە هێنامان.

كەواتە:

ئەو بۆنەو جەژن‌و یادانەی كە مۆركێكی ئیسلامییان هەیە، یان نەتەوەیی‌و نیشتیمانیین، یان جیهانیین، وە تایبەت نین بە كەسانێكی كافرەوە دروشم‌و جیاكەرەوەیان نین، هەر لەسەر بنەڕەتیی خۆیان كە ڕەواییە ماونەوەو، مادام مسوڵمانان بەرژەوەندییان تێدا ببینن، هیچ ڕێگرێكیان نیە سوودیان لێ

---

[1] فتاوى علماء البلد الحرام، ص٩٤٤.

ببینین، وەك هەر بیرۆكەو ئەزموون و ئامرازو شێوازێكی دیكەی سوود بەخش.

## بەڵگەی سێیەم: كارو ڕەفتارو قسەی ناشەرعییان تێدادەكرێ:

وەڵامی ئەم بەڵگەیەش ئەوەیە كە:

شتی هەڵەو ناشەرعیی هەمیشە هەر ڕەتكراوەیە، چ لە بۆنەو جەژنەكانداو، چ لە هەر حاڵەتێكی دیكەشدا، بەڵام بێگومان بۆنەیەكی شەرعیی لەبەرئەوەی كە هەڵەو ناشەرعیی تێدادەكرێ، خۆی نابێتە ناشەرعیی، بۆ وێنە:

هاوسەرگیریی و زەماوەند حەڵاڵە، بەڵام كەسێك كە لە پەنای ئەو شتە حەڵاڵەدا، دەچێ شتێكی حەڕامی وەك (ڕەشبەڵەك) دەكات، ناگونجێ خودی زەماوەندەكەشی لەگەڵ قەدەغە بكەین!

هەروەها كەسێك كە دەچێ لە پەنای سەیران و گەشتی ڕەوادا، شەڕاب دەخواتەوەو قومار دەكات و...هتد، ناگونجێ بڵێین: گەشت و سەیرانەكەشی هەر قەدەغەیە!

كەواتە: پێویستە تەماشای ئەو یادو بۆنەو جەژنانە بكەین كە لە بنەڕەتدا ڕەوان: ئەگەر بۆ ئامانجێكی پێویست و پەسند (واجب و مندوب) یان لانی كەم ڕەوا (مباح) دەكران و، بەشێوەیەكی ڕەوا ئەنجام دەدران، ئەوە دەڵێین: ڕەوان بەڵام ئەگەر شتی ناڕەوایان لەگەڵدا ئاوێتە كرابوو، ئەوە شتە ناڕەوایەكە جیادەكەینەوەو ڕەتیدەكەینەوە، ئەوەش كە ڕەوایە لەسەر ئەسڵی خۆی دەمێنێتەوە.

دیارە پێشتریش لە بنەمای شەشەمدا خستمانەڕوو كە: ((شتی ڕەوا بەهۆی بەهەڵە بەكارهێنرانی و، خراپە ڕەگەڵ خرانییەوە، حوكمە ئەسڵییەكەی ناگۆڕێ و قەدەغە نابێ)).

هەڵبەتە ئەگەر بەگوێرەی ئەو بنەمایەش ڕەفتار نەکەین، مەگەر چۆن دەنا هیچ شتێکی چاکمان بەدەستەوە نامێنێ، چونکە زۆربەی هەرەزۆری شتە باشەکان، خەڵك ناهەقیی و ناشەرعیی و هەڵەو پەڵەیان لەگەڵ تێکەڵ دەکەن، یان بەشێوازی هەڵەو خراپ و بۆ ئامانجی خراپ بەکاریان دێنن.

## بڕگەی دووەم: لەبێژینگدانی قسەکانیان:

لە بڕگەی دووەمی ئەم هەڵسەنگاندنەماندا، بە پێویستی دەزانم چەند قسەیەکی (إبن باز) و (إبن عثيمين) بەتایبەت لە مەحەکی عەقڵ و نەقڵ بدەین، کە لەو قسانەیاندا هاتبوون، کە پێشتر لێیانەوە هێنامانن:

### یەکەم: (إبن باز):

یەك: لە وەڵامی پرسیارێکدا کە لەبارەی شەرعییبوون یان شەرعییەنەبوونی یادکردنەوەی بیرەوەریی لەدایك بوونی پێغەمبەر (محمد) ﷺ، وە شەوی شەوڕۆو بەرزبوونەوەو کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە، ئاڕاستەی کراوە، پاش چەند قسەیەك گوتوویەتی: (فلَيسَ لأحَدٍ أن يُحْدِثَ في دينهِ ما لَمْ يشرِّعْهُ الله "عزّ وجل" كما قال ﷺ: (مَنْ أحدثَ في أمرنا هذا ما ليسَ منه فهوَ ردٌ) متفق عليه عن عائشة، و أخرج مسلم في صحيحه عنها: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً ليسَ عليهِ أمرنا فهوَ ردٌ)...).

کە پێشتر تەواوی قسەکانیمان هێناو ماناشمان کردن، لە وەڵامیدا دەڵێین:

وەك پێشتر باسمان کردو سەلماندیشمان کە یادو بۆنەو جەژنەکان لەجۆری

عـادەت و هـەڵس و کەوتـەکانن و، لـە خانـەو بازنـەی عیبادەتـدا نـین، تـاکو بـە چەمك و واتای (دین) بە بەشێك لە (دین) دابنرێن و، داهێنانیان بە داهێنان لـە ئاییندا (الإبتداع في الـدين) و زیـادکردن لـە دینـدا دانـانرێ، بـەڵکو بـە داهێنـان لەبواری هەڵس و کەوتەکان (الإبداع في المعاملات)دا دادەنرێن.

هـەروەها هـیچ کـام لـە ئایـەتی: ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ...﴿٢١﴾ ﴾ الشورى، وە فەرموودەکانی: (مَـنْ أحـدثَ في أمرنـا هذا مـا لـيسَ منـه فهوَ ردٌ) وە (مَـنْ عَمِـلَ عَمَـلاً لـيسَ عليـهِ أمرنـا فهوَ ردٌ)، وە فەرموودەی: (أمَّا بَعدُ، فَإنَّ خير الحديث كتاب الله و خَيرَ الهَدْيِ هَدْيُ محمدٍ ﷺ و شـرَّ الأمـورِ مُحْـدَثَاتُها، وكـلَّ بِدعـةٍ ضـلالة) رواه مسـلم: ٨٦٧، ناگونجـێ بکرێنە بەڵگەی ئیسپاتی ناڕەوایی ئەنجامدانی ئـەو یـادو بۆنانـەی کـە لـەخودی خۆیاندا ناشەرعیی نین و، مسوڵمانانیش سوودو بەرژەوەنـدییان تێـدا دەبیـنین، چونکە:

١/ داهێنان لەبواری هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا، ئیزن و مۆڵەتی شـەریعەتی خوای لەسەرەو چەمکی ڕستەی: ﴿ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ نایگرێتەوە.

٢/ وە یـادو بۆنـەکان مـادام لەبازنـەی عیبادەتـدا نـەبن، ئەنجامـدەرانیان چەمکی فەرموودەکانی (مَنْ أحدثَ في أمرنا هذا) و (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لـيسَ عليـهِ أمرنـا) نایانگرێتـەوە، چـونکە هـیچ شـتێکیان لـە ئاییـندا دانـەهێناوەو زیـاد نـەکردوە، مەگـەر کەسـێك ئـەو یـادو بۆنانـە بـە خـەیاڵی خـۆی بـەجۆرێك لـە عیبـادەت بزانـێ، کـە ئەوکاتـە بێگومـان یادکردنەوەکـەی بـە بیدعـەت و شـت زیادکردن لە ئاییندا دادەنرێ.

٣/ هەروەها یادو بۆنەکان مادام لەبازنەی عیبادەتدا نەبن، چەمکی ڕستەی:

(و شرَّ الأمورِ مُحْدَثاتها وكلَّ بِدعةٍ ضلالة) نایانگرێتەوە، چونکە بەدڵنیاییەوە مەبەست لە شتە پەیداکراو و داهێنراوەکان، ئەوانەن کە لەبواری عەقیدەو عیبادەتدا پەیدادەکرێن، نەك بەگشتی، ئەگەر نا دەبووایە سەرجەم ئەو شتانەی کە لە بوارەکانی حوکمو سیاسەتو جەنگو ئاشتییو ئیدارییو پیشەسازییو بازرگانییو...هتددا، داهێنراونو پەیداکراون، بیانگرێتەوە، هەرچەندە هیچ دەقێکی تایبەتیش لەسەر قەدەغەکردنیان نەبێو، بەرژەوەندییشیان تێدابێ!

دوو: هەروەها هەر لەوبارەوە "وەك پێشتر قسەکانیمان هێناو ماناشمان کردن" دەڵێ: **(وهذه الإحتفالات التي ذكرت في السؤال لم يفعلها الرسول... ولم يَفْعَلْها أصحابه... ولم يفعلها أئمة الهدى في القرون المُفَضَّلة...)**.

وەڵامەکەشی ئەوەیە کە بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزو زانایانی پێشین بەو یادو بۆنانە هەڵنەستاون، بەڵام بێگومان مەرجی بواری هەڵسو کەوتو عادەتەکان، ئەوە نیە کە پێغەمبەری خوا "صلى الله عليه وسلم" پاشان هاوەڵانی "خوا لێیان ڕازی بێ" و زانایانی پێشین "خوا لێیان خۆشبێ" کردبیانن، چونکە ئەگەر وابێ، دەبێ زۆرێك لە هەڵسو کەوتو عادەتەکانی ئێستامان ناشەرعییو گوناه بن، هەرچەندە پێچەوانەی هیچ دەقێکی شەریعەتیش نەبنو پەکیشمان لەسەریان کەوتبێ، هەر دوور نەڕۆین:

هەبوونی دەستەی فەتوادان لە سعوودیە (هيئة الإفتاء في السعودية)، شێخی ئەزهەر لە میسر (شيخ الأزهر في مصر)! کە دوو شتی پەیداکراونو پێشتر شێوەو وێنەیان نەبووە!

سێ: دیسان هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: (ولم يُشَرِّعْ لنا سبحانه وتعالى عيداً

للميلاد لا ميلاد النبي و لا غيره بل قد دلت الأدلة الشرعية من الكتاب و السنة على أن الإحتفال بالموالد من البدع المحدثة في الدين، ومن التشبُّه بأعداءِ الله من اليهود و النصارى و غيرهم...).

ئێمەش دەڵێین:

١- جەژن و یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺ چونکە عیبادەت نەبووە، بۆیە خوا "عزّ وجل" داینەناوە، بەڵام کە داشینەناوەو فەرمانیشی پێنەکردوە، لە هیچ دەقێکی شەریعەتیشدا ڕێی لێ نەگرتوەو، لە ناوچەی بەجێهێڵراو (منطقة العفو)دا هێشتوویەتەوە، وە ڕاستیش نیە کە بەڵگەکانی شەرع لە قورئان و سوننەت، ڕێیان لەو یادو بۆنانە گرتبێ و، ئایەت و فەرموودەکان بەگشتی باسی قەدەغەبوونی لادان و شت لە ئاییندا پەیداکردن و داهێنان دەکەن و، هەڵسان بەو یادو بۆنانەش وەك عادەتێکی باش و بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیی دین و ژین، بە لادان و شت لە ئاییندا پەیداکردن دانانرێ.

٢- پێشتریش باسی مەسەلەی خۆچواندن بە کافران (التشبُّه بالكفّار)مان کرد، کە تەنیا لە حاڵەتێکدا بە خۆبەکافران چواندن دێتەدی، کە مسوڵمانان لەو شتانەدا چاویان لێ بکەن و وەك وان بکەن، کە تایبەتمەندیی ئایینی ئەوانن، نەك لە هەموو شتێکدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ وەك (بخاري و مسلم) هێناویانە:

پاش ئەوەی ویستی نامە بۆ پادشاکانی فارس و ڕۆم و میصر بنووسێ و هەواڵیشیان پێدا کە پادشایەکان نامەی بێ مۆر (خَتم) ناخوێننەوە، فەرمانی کرد مۆرێکی بۆ دروست بکەن کە لە سەری نووسرابوو: (محمد رسول الله)،

بەڵام بەم شێوەیە بوو: (الله محمد رسول)[1]، هەروەها كە لە ڕۆژگاری (عمر بن الخطاب) خەلیفەی دووەمی پێغەمبەردا "خوا لێی ڕازی بێ"، دەوڵەتی ئیسلامیی فراوان بوو، عومەر كۆمەڵێك ڕێكخستنی ئیداریی ڕۆم و فارسەكانی بەكارهێنا وەك:

١- دانانی دیوانەكان (تدوین الدواوین)، ٢- دانانی پۆستە (البرید)، ٣- دانانی حەپسخانە (السجن)، ٤- دروستكردنی شارەكان (تعمیر الأمصار)، ٥- دانانی سوپای تەرخانكراو (الجیش النظامي)...

دیارە هیچ كەسیش نەیگوت: ئەو شتانە خۆپێچواندنی كافرانی فارس و ڕۆمن!!

ئنجا بێگومان فەرموودەی: (لَتتبعُنَّ سَنَن الذین من قبلكم...) مەبەست ئەو كەسانەیە كە لە تایبەتمەندییەكانی كافراندا شوێنیان دەكەون، كە زیاتر لەبواری عەقیدەو عیبادەتدا بەرجەستە دەبن، نەك لەبواری هەڵس و كەوت و عادەتەكاندا، كە بناغە تێیاندا ڕەوایی و دەستكراوەییە، مەگەر شتێك بە دەقێكی تایبەت قەدەغە كرابێ.

## دووەم: (إبن عُثیمین):

ئەمیش لەو قسانەدا كە پێشتر لێیەوە نەقڵمان كردن و ماناشمان كردن، چەند شتێك دەڵێ، بۆ نموونە:

---

[1] - عن أنس أنَّ النبيَّ ﷺ أراد أن یكتب الى كسرى وقیصر والنجاشي، فقیل: إنهم لایقبلون كتاباً الأ بخاتم، فصاغ رسول الله ﷺ خاتماً حلقةُ فِضَّةٌ ونقش فیه: محمد رسول الله. رواه البخاري: ٦٥، ومسلم: ٥٨/٢٠٩٢.

یەك: لەبارەی ئاهەنگ گێڕان (إحتفال) بەبۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە ﷺ گوتوویەتی: (... **ومن الناحية الشرعية فالإحتفال لا أصل له أيضاً لأنه لو كان من شرع الله لفعله النبيّ أو بلغه لأُمته... و إذا لم يكن من دين الله فإنه لايجوز لنا أن نتعبَّد به لله "عزّ وجل" و نتقرَّب به لله**...).

ئێمەش دەڵێین:

١- شەرعیی نەبوونی شتێك، دوو واتای هەن:

أ/ دەقێکی شەریعەتی لەسەر نیە (واتە: قورئان و سوننەت)، کە بێگومان ئەوە بەس بۆ بواری عیبادەت (ئیمان و عەقیدەو دروشمەکان) پێویستە، چونکە وەك لە (بنەمای پێنجەم)دا هاتوە، بناغە لە خواپەرستییەکاندا شوێنکەوتن (إتباع)ە.

ب/ پێچەوانەی دەقێکی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەریعەتە.

ئنجا دەڵێین: بەڵێ هیچ دەقێکی قورئان و سوننەتی ڕوون لەسەر یادو بۆنەکان نیە کە بفەرموێ: بیانکەن، یان ڕەوان، بەڵام هیچ دەقێکیش لەسەر ڕێ لێگرتن و قەدەغەکردنیان نیەو، ڕەوابوونی شتێکیش لەبواری هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا، هیچ پەکی لەسەر دەقێکی تایبەت نەکەوتوە، چونکە بناغە تێیاندا ڕەوایی و ڕێپێدرانە[1].

٢- بێگومان پەرستش بۆ خواو خۆ لێ نیزیك خستنەوەی (التعبد لله و التقرب إليه) تەنیا بەو شتانە دەکرێ کە خواپەرستیی (عبادة)ن، ئنجا مادام

[1] - {فقال ابن عقيل: فإن أردت بقولك: (({الاّ ما وافق الشرع} أي: لم يُخالِف ما نطق به الشرع، فصحيح، وإن أردت: لاسياسة الاّ ما نطق به الشرع، فغلطٌ وتغليطٌ للصحابة...))} الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، ص٢٢، لابن قيم الجوزية.

یادو بۆنەکان لەجۆری هەڵس و کەوت و عادەتەکانن، دیارە بەمەبەستی ئەوە ناکرێن کە ڕاستەوخۆ مرۆڤ لە خوا نیزیك بخەنەوە، هەرچەندە بەنیەتی باشەوە بە طاعەت دادەنرێن و، پاداشتیشیان لەسەر هەیە، وەك لە (بنەمای حەوتەم)دا خستمانەڕوو.

٣- پاشان دەڵێین: ئەگەر مەبەست لەوە، کە یادو بۆنەکان بەشێك نین لە ئایینی خوا، ئەوە بێ کە دەقێکی تایبەتی شەریعەتیان لەسەر نیە، ئەوە ڕاستەو، ئەمەش تەنیا لەبواری عەقیدەو عیبادەتدا بە مەرج گیراوە.

بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوەبێ کە پێچەوانەی شەریعەتن و، بەڵگەیان لە شەریعەتدا لەسەر نیە، ئەوە هەڵەیە، چونکە بواری عادەت و هەڵس و کەوتەکان، ئەسڵ و بناغە تێیاندا ڕەواییەو، ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەی شەریعەتە بۆ ڕەوا پێدانی سەرجەم ئەو شتانەی کە مسوڵمانان بەرژەوەندیی دین و ژینی خۆیانیان پێ دێننەدی، لەو بوارەدا کە سەنگی مەحەك تێیدا هێنانەدی بەرژەوەندیی (تحقیق المصلحة)یە.

دوو: هەروەها هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: (هذا الإحتفال ان كان من كمال الدين فلا بُدَّ أن يكون موجوداً قبل موت الرسول ﷺ، و إنْ لم يكن من كمال الدين، فإنّه لايمكن أن يكون من الدين، لأنَّ الله تعالى يقول: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾، **وَمَنْ زَعَم أنه من كمال الدين، و قد حدث بعد الرسول، فإنَّ قوله يتضمَّنُ تكذيب هذه الآية...**) کە پێشتر هێنامان و ماناشمان کرد.

ئێمەش دەڵێین:

١- ئەو قسانە هەموویان لەسەر ئەوە بنیات نراون، کە یادو بۆنەکان "لەنێوانیشیاندا یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ" جۆرێکن لە خواپەرستیی

(عبادة)، بەلاّم وەك پێشتر "لە بەشی یەکەم و لە (بنەمای هەشتەم) و (بنەمای نۆیەم) دا- خستمانەڕوو یادو بۆنەکان لە بازنەو خانەی هەڵس و کەوت و عادەتەکاندان.

کەواتە:

یادو بۆنەکان هەرچەندە بەشێك نین لە تەواویی ئایین (کمال الدین)، بەلاّم پێچەوانەی ئایین نین و، لەگەڵیشی ناکۆك نین "وەك پێشتریش باسمان کرد" چونکە ئایین خۆی ڕێی داوە کە مسوڵمانان هەرچی بە باشی دەزانن و، پێیان وایە بەرژەوەندیی دین و ژینیان دابین دەکات، لە بواری هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا، بیهێننەدی.

٢- بەڕەوادانانی یادو بۆنەکان ئەوە ناگەیەنێ کە فەرمایشتی خوا: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ ڕاست نیە، چونکە دەڵێین:

یادو بۆنەکان بەشێك نین لە دین، تاکو بگوترێ: چۆن دەبێ دین بەشێکی پاش مردنی پێغەمبەر ﷺ دابنرێ؟ بەڵکو هەڵس و کەوتێکن کە ئیسلام، ئایینی تێرو تەواوی خوا، بە دەقە گشتییەکانی ڕێی پێداون، ئاشکراشە ئایین و بەرنامەی تێرو تەواوی خوا، ڕێی هێنانەدی هیچ بەرژەوەندییەك لە شوێنکەوتووانی خۆی ناگرێ!

سێ: دیسان هەر لەوبارەوە گوتوویەتی:

(ولا ريب أن الذين يحتفلون بمولد الرسول ﷺ إنّما يريدون بذلك تعظيم الرسول وإظهار محبته و تنشيط الهمَم على أن يوجد منهم عاطفة في ذلك الإحتفال للنبي و كل هذا من العبادات... و إن كان عبادة فإنه لايجوز أبداً أن يُحْدَثَ في دين الله ما ليس منه...) کە پێشتر هێنامان و ماناشمان کرد.

ئێمەش دەڵێین:

١- هەرچەندە خۆشویستن و ڕێزگرتن و بەگەورەگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەخواپەرستیی ڕاستەوخۆ (العبادة المباشرة) بۆ خوا دانانرێ و، تەنیا فەرمانبەریی خوا (إطاعة الله)یە، بەڵام ئەگەر گریمان قسەی (إبن عثیمین)یش بسەلمێنین و ئەو شتانە خواپەرستیی (عبادة)بن، ئەوە هیچ گرفتێك لەئارادا نیە، چونکە خوای کاربەجێ کاتێك فەرمانی بە ئیمانداران کردوە کە شوێن پێغەمبەرەکەی بکەون: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ ...(٣١) ﴾ آل عمران، وە ئیمانی پێ بێنن و ڕێزی بگرن و پشتی بگرن: ﴿ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٥٧) ﴾ الأعراف، هەروەها بە حورمەت ڕێزو بەگەورەگرتنەوە مامەڵەی لەگەڵ بکەن، ﴿ لِّتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا (٩) ﴾ الفتح، بەڵێ کاتێك فەرمانی بەوە پێکردوون، بەگشتی فەرمانی پێکردوون و، میکانیزم و چۆنیەتی و شێوەی ئەو ڕێزلێگرتن و خۆشویستن و بەگەورەگرتن و پشتگرتنەی دیاری نەکردوە، هەروەها کات و شوێنی دیاریی نەکردوون، بۆیە بەهەر شێوەیەك و لەهەر کاتێکداو لەهەر جێیەکدا، ئەو فەرمانانە جێ بەجێ بکرێن، شەرعیی و پەسندە و هیچ گرفت و ئیشکالێکی تێدا نیە.

٢- ئنجا ئەگەر یادکردنەوەی لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەوە بە بیدعەت و زیادکردن لە دیندا دابنرێ، کە باسی خۆشویستن و ڕێزلێگرتن و بەگەورەگرتنی پێغەمبەری تێدادەکرێ، دەبێ بەهەمان شێوە دەرس و وتاری وانە بێژانیش لە قوتابخانەو زانکۆیەکان و هۆڵەکانیشدا، کە ڕێزو

خۆشەویستیی‌و پشتگیریی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەبڕن، هەمووی هەر بیدعەت‌و داهێنان بێ لە ئایینـدا، چونکە بەشێوەو میکانیزمێک‌و لە کات‌و شوێنێکدا ئەنجام دەدرێ، کە پێغەمبەری خواو هاوەڵانی‌و زاناو پێشەوایانی پێشین (علماء و أئمة السّلف) نەیانفەرمووەو نەیانکردوە!!

٣- لەڕاستییدا داهێنانی شێوازو ئامرازو چۆنیەتی تازەو هاوچەرخ بۆ جێبەجێکردنی ئەمرو نەهییە دێرینەکانی قورئان‌و سوننەت، مانای ئەوە نیە کە شتێك لە ئیسلام زیادکراوەو ئایین‌و بەرنامەی تێرو تەواو (کامل) خوا بە ناتەواو دانراوە! بەڵکو مەسەلە تەنیا ئەوەیە کە بەشێوازو چۆنیەتی‌و ئامرازی تازەو هاوچەرخ، خزمەتی ئایین‌و بەرنامە تێرو تەواوەکەی خوا کراوە، وە ئایینی ڕاست‌و تەواوی خوا، هەرگیز ڕازی نابێ شوێنکەوتووانی بەشێوازو ئامرازو چۆنیەتی کۆن‌و نەگونجاو و کات بەسەرچوو، خزمەتی بکەن‌و، سەرەنجام ئایینەکەیان‌و خۆشیان وا بخەنە بەرچاو کە لە ڕەوتی ڕۆژگارو ژین بەجێماون !

چوار: هەروەها (إبن عثيمين) کاتێك لەبارەی جەژنی دایك (عيد الأم)ەوە پرسیاری لێکراوە کە لەڕۆژی: ( (٢١)ی مارس)ی هەر ساڵێك دایە، گوتوویەتی:

(إن كل الأعياد التي تخالف الأعياد الشرعية كلّها أعياد بِدَعٍ حادثة ما كانت معروفة في عهد السلف الصالح، ورُبَّما يكون منشؤها من غير المسلمين أيضاً، فيكون فيها مع البدعة مشابهة أعداء الله "سبحانه وتعالى"... وإذا تبيَّن ذلك فإنه لايجوز في الذي ذَكَرتِ السائلة و التي سَمَّتْهُ عيد الأم، لايجوز فيه إحداثُ شيءٍ من شعائر العيد كإظهار الفَرَحِ و السرور و تقديم الهدايا و ما أشبه ذلك...) کە پێشتر هێنامان‌و ماناشمان کرد.

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین:

١- هیچ دەقێکمان نیە جەژنە شەرعییەکان و ناشەرعییەکانی لەیەك جیاکردبنەوە، بەڵێ "وەك پێشتر باسمان کرد" هەرکام لە جەژنەکانی قوربان و ڕەمەزان و ڕۆژەکانی تەشریق و ڕۆژی جومعە، بە ڕۆژانی جەژنی مسوڵمانان دانراون، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە کە نەگونجێ مسوڵمانان هیچ یادو بۆنەیەکی دیکەیان هەبێ، چونکە مادام جەژن و بۆنەکان لەبازنەی هەڵس و کەوت و عادەتەکاندا بن، مسوڵمانان دەستیان کراوەیە کە ڕۆژانی دیکەش بەبۆنەی دیکەوە، بکەنە ڕۆژی یادکردنەوەو خۆشیی و شادیی دەربڕین و گردبوونەوە.

کەواتە: هەر بۆنەو جەژن و یادێك کە نێوەڕۆك و شێوازەکەی لەخودی خۆیدا پێچەوانەی شەریعەت نەبێ، ئەوە لەسەر ئەسڵی خۆی کە ڕەواییە ماوەتەوەو، سەرجەم جەژن و بۆنەکان شەرعیین، مەگەر ئەوەی لەگەڵ دەقێکی شەریعەتدا تێك بگیرێ.

٢- پێشتر باسمان کرد کە چاولێکردنی کافران و خۆپێچواندنیان، تەنیا لەو شتانەدا قەدەغەو ڕێلێگیراوە، کە تایبەتمەندیی ئاییینیی ئەوانن، ئەگەرنا سوودمەندبوون و بەهرە وەرگرتنی مسوڵمانان لە غەیری خۆیان، شتێکی ڕەواو پەسندو بگرە جاری وایە پێویستیشە، بەپێی فەرموودەی خوا: ﴿...فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ... ﴿١٨﴾﴾ الزمر، وە بەپێی شوێنەوار (أثر)ی: (الحكمة ضالة المؤمن، فحيثما وجدها فهو أحق بها) رواه الترمذي.

هەڵبەتە دیاریکردنی ڕۆژێکیش بۆ تێدا یادکردنەوەی ڕێزو حورمەتی

دایكو مافەكانیو جەخت لەسەر كردنەوەیان، هەروەها: منداڵو مامۆستاو كرێكارو زیندانییو ڕۆژنامەنووسو... هتد، نەك هەر لەگەڵ هیچ ئایەتو فەرموودەیەكدا دژو پێچەوانە نیە، بگرە چەندان ئایەتی قورئانو دەقی سوننەت هەن، كە بە چەمكو واتای گشتیو تایبەتییان دەلالەت لەسەر ئەو ئامانجانە دەكەن، كە ئەو یادو بۆنانەیان بۆ دانراون.

٣- ئنجا بەڕاستیی شتێكی سەیریشە (إبن عثیمین) خوا لێی خۆشبێ، هەركام لە خۆشحاڵییو شادمانیی دەربڕینو دیارییو خەڵات بەخشینەوەی، بە دروشمەكانی جەژن داناون: (لايجوز فيه إحداثُ شيءٍ من شعائر العيد كإظهار الفَرَحِ و السرور و تقديم الهدايا و ما أشبه ذلك...) چونكە بێگومان ئەو جۆرە شتانە تایبەت نین بە جەژنەوەو، گریمان ئەگەر تایبەتیش بن، هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەوەی كە دروست نیە لە غەیری ڕۆژی جەژندا شادمانیی دەربڕیو دیارییو خەڵات ببەخشرێتەوە !

لێرەشدا كۆتایی بە بەشی دووەم دێنینو، دەگوازینەوە بۆ بەشی سێیەمو كۆتایی، كە تەرخانمان كردوە بۆ باسی (نەورۆز).



## بەشی سێیەم

# لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی ڕەوایی‌و نا ڕەوایی یادکردنەوەی ڕۆژی نەورۆزەوە



خوا پشتیوان بێ ئەم بەشی سێیەمە کە تەرخانمان کردوە بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی بۆنەی نەورۆزو ڕەوایی و ناڕەوایی یادکردنەوەی و ئاهەنگ تێداگێڕانی، بۆ پێنج خاڵی سەرەکیی دابەش دەکەین، کە ئەمانەن:

**یەکەم:** چەمك و واتای وشەی (نەورۆز) و کات و هەل و مەرجی سەرهەڵدانی.

**دووەم:** تێڕوانینی زانایان بۆ جەژنی نەورۆزو، مامەڵەی حوکمڕانانی دەوڵەتی ئیسلامیی لەگەڵیدا، جۆراو جۆر بووە.

**سێیەم:** ئاگرکردنەوەی ڕۆژی نەورۆزو، ئاگری بەردەوامی مەجووسییەکان، دووشتی جیاوازن.

**چوارەم:** حوکمی یادکردنەوەی نەورۆز، لەبەر ڕۆشنایی عادەت و باو و هەل و مەرجی ئێستایدا دیاریی دەکرێ.

**پێنجەم:** بۆنەی نەورۆزو ئاگر تێداکردنەوەی، چ شادیی دەربڕین بێ، بەسەرەتای بەهارو نەمانی سەرماو زوقمی زستان، چ شادمانیی بێ، بەنەمانی ستەمکارێکی خوێن مژو دەربازبوونی خەڵکێکی چەوساوە، گرنگ ئەوەیە شێوازو ئامانج و نێوەڕۆکێکی پێچەوانەی شەریعەتی نەبێ.

## یەکەم: چەمك و واتای وشەی (نەورۆز) و کات و هەل و مەرجی سەرهەڵدانی:

خوێنەری بەڕێز!

بۆ نووسینی سەرگوزشتەی بۆنەی نەورۆزو، کات و هەل و مەرجی سەرهەڵدانی، وێڕای چەند ڕۆژێك گەڕان و پشکنین و پرسیارکردن لەکەسانێکی شارەزا، سوودم لەم سەرچاوانەش بینی:

١- شاهنامه/ حكيم أبوالقاسم فردوسي.

٢- تأريخ الأمم والملوك / لأبي جعفر محمد بن جرير الطبري، ج١

٣- مروج الذهب ومعادن الجوهر/ للمسعودي، ج١.

٤- الكامل في التأريخ / لابن الأثير، ج١.

٥- تأريخ غرر السير / لأبي منصور عبدالملك بن محمد الثعالبي.

٦- موسوعة تأريخ إيران السياسي / د. حسن كريم الجاف، ج١.

٧- الجذور الأسطورية لملحمة نوروز الشعبية / د. حسين قاسم العزيز.

٨- المفصّل في نشأة نوروز الذهنية الإبداعية / د. حسين قاسم العزيز.

٩- کاوەو نەورۆز لەنێوان ئەفسانەو ئاییندا / حسن محمود حمه كريم.

١٠- نەورۆز لەڕەگ و ڕیشەی مێژوودا، خوێندنەوەیەکی ئایینیانە بۆ ئەفسانەی نەورۆزو کاوەو ئاگر / حسن محمود حمه كريم.

١١- (الكرد وكردستان: جدلية الأسطورة والتأريخ والدين) د. فرست مرعي.

## چەمك‌و واتای وشەی (نەورۆز)

وشەی (نەورۆز) وشەیەکی لێکدراوە لە هەردووك وشەی (نەو) و (رۆز)، واتە: ڕۆژی نوێ (اليوم الجديد) کە ئێستا بە ڕۆژی بیست‌و یەکی مارت (٣/٢١)ی هەر ساڵێك دەگوترێ‌و[١]، هەرکام لەنەتەوەی کوردو فارس بەسەرەتای ساڵی خۆیانی دادەنێن.

هەرچەندە لەکتێب‌و سەرچاوە عەرەبیی‌و فارسییەکاندا، تایبەت گراوە بە نەتەوەی فارسەوەو باسی کورد نەکراوەو، هۆکاری سەرەکیی ئەوەش بریتیی بووە لە بێ قەوارەیی‌و بێ دەوڵەتیی کورد[٢].

## هەل‌و مەرج‌و کاتی سەرهەڵدانی نەورۆز

بەنسبەت کاتی سەرهەڵدانی نەورۆزیشەوە، وەك جەژن‌و بۆنەیەك کە ساڵانە لەلایەن ژمارەیەك گەلانی دنیاوە یاد دەکرێتەوە، وەك کورد، فارس، ئەفغان، تاجیك، ئازەر، ئۆزبەك، عێراقییەکان، میصرییەکان... مێژوونووسان یەك قسەنین‌و ڕاجیایی زۆریان هەیەو، هەندێکیان دەڵێن: وا پێدەچێ پێش ئەوەی (فیردوسی) لە (شاهنامە)کەی خۆیدا وەك گەلێك بەسەرهات‌و ئەفسانەی دیکە تۆماری بکات، پێشتر تەنیا وەك چیرۆکێکی دەماودەم گێڕرابێتەوە[٣].

---

[١] - المعجم الوسيط، ص٩٦٢ ط٢، وە (المنجد) ص٨٥٠، ط٤٣.

[٢] - میللەتان بەبێ قەوارەی سیاسیی، بوون‌و مێژوو و ئایین‌و کلتووری خۆیان بۆ ناپارێزرێ.

[٣] - نەورۆز لە ڕەگ‌و ڕیشەی مێژوودا... لاپەڕە:٦.

شایانی باسیشە کە (نۆڵدکە) ڕۆژهەڵاتناسی ناودار ڕای وایە کە کتێبی: (خدای نامە) کە بەزمانی پەهلەویی بووەو دوایی بۆ فارسی وەرگێڕراوە، سەرچاوەی سەرەکی هەرکام لە (شاهنامە)و کتێبە عەرەبییەکانیشە، کە لەبارەی مێژووی کۆنی ئێرانەوە نووسراون[1].

دیارە بەسەرنجدانی مێژووی کۆچی دوایی مێژوو نووسە بەعەرەبیی نووسەکانی وەك: (اليعقوبي) و (الطبري) و (المسعودي) و (الثعالبي)یش‌و، بەراورد کردنیان لەگەڵ هی (فردوسی)دا، بۆمان دەردەکەوێ کە مەگەر فیردەوسی لەوانی وەرگرتبێ، ئەگەرنا ناگونجێ ئەوان هیچیان لەفیردەوسی وەرگرتبێ، چونکە:

١- (اليعقوبي) خاوەنی: (تأريخ اليعقوبي) لە ساڵی: (٢٩٢)ی کۆچییدا مردوە.

٢- (الطبري) خاوەنی: (تأريخ الأمم والملوك) لەساڵی: (٣١٠)ی کۆچییدا مردوە.

٣- (المسعودي) خاوەنی: (مروج الذهب ومعادن الجوهر) لە ساڵی: (٣٤٦)ی کۆچییدا مردوە.

٤- (الثعالبي) خاوەنی: (تأريخ غُرَر السِّير) لەساڵی: (٤٢٩)ی کۆچییدا مردوە.

٥- بەڵام فیردەوسی خاوەنی: (شاهنامە) لەساڵی: (٤٣٨)ی کۆچییدا مردوە.

کەواتە: ناگونجێ بڵێین: (شاهنامە)ی فیردەوسی یەکەمین سەرچاوەی نووسراوە، کە باسی بەسەرهاتی ئەفسانەیی کاوەی ئاسنگەرو ئەژدەهاك (ضحاك)و جەژنی نەورۆزی کردوە، ئەوەتا (المسعودي) لەباسی (جمشيد)دا گوتوویەتی: (وذهب كثير من الناس الى أن النَّيروز في أيامه أحْدِثَ وفي ملكه

[1] - الجذور الأسطورية لملحمة نوروز الشعبية، ص٢٣٢ط:٢٠١٠.

رُسِمَ)[1]، واتە: وە زۆرێك لەخەڵكی پێیان وایە كە لەڕۆژانی حوكمڕانیی ویدا نەورۆز داهێنراوەو كراوەتە بۆنەیەكی فەرمیی.

ئنجا لەبارەی هۆكاری پەیدابوونی نەورۆزەوە، وەك جەژن و بۆنەیەك بەگشتیی، سێ بۆچوون هەن:

**یەك:** ڕاپەڕین و شۆڕشكردنی خەڵك و جەماوەرێكی چەوسێنراوە، بە ڕابەڕایەتیی كاوەی ئاسنگەر (كاوە الحداد)، لەدژی ئەژدەهاك (ضحاك) كە حوكمڕانێكی زۆردارو خوێنڕێژ بووە، كە دوایی بەسەرهاتەكەی باس دەكەین.

**دوو:** دەربازبوونی خەڵك لەوشوێنانەدا كە زستانیان زۆر ساردە، لەسەرماو زوقم و، كەوتنە نێوكەشی بەهارەوەو دەستپێكردنی ساڵێكی نوێ.

**سێ:** نیشتنەوەی كەشتیەكەی (نووح) "علیه السلام" و لەنگەرگرتنی لەسەر چیای جوودیی، كە خوای كاربەجێ لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤ ﴾ هود، واتە: وەگوترا: ئەی زەوی ئاوەكەت قوت بدە! وە ئەی ئاسمان، چیدیكە مەبارێنە ! وەئاوەكە ڕۆچوو و نەما وەكارەكە تێپەڕی، وە (كەشتییەكە) لەسەر (چیای) جوودیی لەنگەری گرت، وەگوترا: دووریی (لەبەزەیی خوا) بۆ كۆمەڵی ستەمكاران.

ئەم ڕایەش هی مامۆستا (حەسەن مەحموود حەمە كەریم)ە[2] و نەمبینیوە كەسی دیكە پێش وی گوتبێتی، بەڵام (الطبري) گوتوویەتی: (...وقد بلغنا أن

[1] - مروج الذهب، ج١، ص١٧٧.

[2] - كاوەو نەورۆز لەنێوان ئەفسانەو ئاییندا، لاپەڕە: ١٢، چاپی یەكەم.

الضحاك هو نمرود وأن ابراهيم خليل الرحمن ﷺ ولد في زمانه وأنه صاحبه الذي أراد إحراقه...)[1]، واته: وەپێمان گەیشتوە کە ئەژدەهاك نەمرووده، وە ئیبراهیم دۆستی نیزیکی خوا ﷺ لەرۆژگاری ئەودا لەدایك بووەو، هەر ئەویش بووە کە نەمروود ویستوویەتی بیسووتێنێ.

شایانی باسیشە کە بەسەرهاتی هەوڵدان بۆ سووتاندنی ئیبراهیم "عليه السلام" لەلایەن (نەمروود)ەوە لەسوورەتی (الأنبياء)دا هاتوە، کە ئەمە بەشێکیەتی: ﴿ قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ (٦٨) قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ (٦٩) وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ (٧٠) ﴾ الأنبياء، گوتیان: ئیبراهیم بسووتێنن و پەرستراوەکانتان سەربخەن، ئەگەر تەمای شتێکتان هەیە، گوتمان: ئەی ئاگر ! ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم، وە ئەوان پیلانیان لە دژ گێڕاو، ئێمەش گێڕامانن لە زیانباران و دەستخەڕۆمان کردن.

هەروەها مامۆستا (حەسەن مەحموود) پێی وایە دەگونجێ کاوەش هەر ئیبراهیم بێ[2]، وە بەپیرۆزگرتنی ئاگر (تقديس النار)یش هەر لەوکاتەوە داهاتبێ و، خەڵکی ئەو ئاگرەیان بەپیرۆز دانابێ کە ئیبراهیمی نەسووتاندووە![3].

بەڵام بێگومان ئەو قسانە هەموویان بۆچوون و شیکردنەوەی مێژوویین و، هیچ بەڵگەو دیکۆمێنت (وثيقة)ێك پشتڕاستیان ناکاتەوە.

---

[1] - تأريخ الأمم والملوك، ج١ ص٩٩، ط دار الفكر-١٩٧٩.

[2] - نەورۆز لەرەگو ڕیشەی مێژوودا... لاپەڕە:١٤.

[3] - هەمان سەرچاوە، لاپەڕە:١١-١٣.

ئنجا بێگومان بەپیرۆزگرتنی ئاگر بەهۆی نەسووتاندنی ئیبراهیمەوە "علیه السلام" شتێکی بێجێیە، چونکە:

سروشتی ئاگر سووتاندنە (طبیعة النار الإحراق)، کەواتە: ئەگەر بەس ئاگر خۆی بووایە، ئیبراهیمی دەگردە قەرە برووت، بەڵام ئەوە خواو بەدیهێنەری ئاگربوو، کە نەیهێشت ئاگر بەپێی سروشتی ئاسایی خۆی ڕەفتار بکات و ئیبراهیم بسووتێنێ، بەڵکو لەجیاتی ئەوە ساردو سەلامەت بێ: ﴿ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء، کەواتە: عەقڵ و مەنتیق خوازیاری ئەوەن، کە بەدیهێنەرو پەروەردگاری ئاگر، بە بەرزو پاک و پیرۆز بگیرێ، نەک ئاگر، کە جگە لەدروستکراوێکی خواو سەربازێکی فەرمانبەری چی دیکە نیە.

منیش بۆچوونی خۆمم هەیە لەبارەی هۆکارو چۆنیەتی پەیدابوونی بیرۆکەی بەپیرۆزگرتنی ئاگرو خۆرو ڕووناکیی، کە پێموایە هەموویان پێکەوە پەیوەستن و دوایی باسیدەکەم.

## ئەفسانەی پادشا ئەژدەهاک و کاوەی ئاسنگەرو فەرەیدوون

دیارە ئەو ئەفسانەیە زۆرێک لەسەرچاوەکانی مێژووی کۆن هێناویانە، لەوانە: (تأریخ الطبري[1]) و (مروج الذهب[2]) و (تأریخ غرر السیر[3]) و (شاهنامە[4])

[1] – ج١، ص٩٨-١٠١.

[2] – ج١، ص١٧٥–١٧٩.

[3] – ص١٧-٣٩.

[4] - شاهنامە، ص٦-١٥.

و (الكامل في التأريخ[1])، بەڵام لەوردەکارییەکانیدا هەندێك جیاوازییان هەیەو، ئەوەش پوختەی ئەو بەسەرهاتە ئەفسانەییە، وەك هەرکام لە (الطبري) و (المسعودي) و (الثعالبي) و (فردوسي) و (ابن الأثير) هێناویانە، بەهەندێك وردە جیاوازییەوە:

پاش یەکەمین پادشای فارس (کیومەرث)، ئنجا هەرکام لە: (ئوشهەنگ) و (طەهموورەث)، کە یەکەمیان هەزار (١٠٠٠) ساڵ و دووەمیان چل (٤٠) ساڵ و سێیەمیان سی (٣٠) ساڵ حوکمڕانییان کردوە، ئەوجار (جەم) یان (جەمشید)ی برای (طەهموورەث) بووبە پادشاو هەندێك دەڵێن: حەوسەد (٧٠٠) ساڵ و[2]، هەندێکیش دەڵێن: شەشسەد (٦٠٠)و هەندێکیش گوتوویانە: نۆسەد (٩٠٠) ساڵ و شەش مانگ حوکمڕانیی کردوە[3]، دیارە جەمشید حوکمڕانێکی زەبر بەدەست و بەکاربووەو، لەڕۆژگاری ویدا دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی زۆر گەشەی ستاندوە، لە هەموو ڕووەکانی پیشە سازیی و سەربازیی و ...هتدەوە[4]، بەڵام جەمشید لەکۆتایی تەمەنیدا وەك (شاهنامە) هێناویەتی، تووشی لەخۆبایی بوون (غرور)و لادان بووەو، لافی پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی (الربوبية والألوهية) لێداوە[5].

---

[1] - ج١، ص٧٤-٧٧.

[2] - شاهنامە، ص٦.

[3] - مروج الذهب، ج١، ص١٧٧.

[4] - شاهنامە، ص٦،٧، وة (مروج الذهب)، ج١، ص١٧٧.

[5] - شاهنامە، ص٧، (برگشتن جمشید أزفرمان خداو برگشتن ڕۆژگار از أو)، واتە: هەڵگەڕانەوەی جەمشید لە فەرمانی خواو هەڵگەڕانەوەی ڕۆژگاریش لەوی.

بۆیە سەرەنجام خەڵك بێزاربووەو زەمینە بۆ ئەژدەهاك (ضحاك)[1] یان (بیوارسب[2]) خۆشبووە کە لە جەمشید ڕاپەڕێو بیکوژێو لەشوێنی وی ببێتە پادشا.

ئنجا ئەژدەهاکیش بۆماوەی هەزار (١٠٠٠) ساڵ جگە لەیەك ڕۆژ حوکمڕانیی کردوە،[3] هەندێکیش گوتوویانە: هەزارو سەد (١١٠٠) ساڵ.[4]

ئنجا سەرەنجام ئەژدەهاکیش دەستی داوەتە ستەمێکی زۆر، هەتا ڕۆژێکیان ئیبلیس لەشێوەی مرۆڤدا خۆی پێشانداوەو گوتوویەتی: من چێشت لێنەرێکی زۆر کارامەم بۆ پادشایانو، ئەگەر حەزدەکەی با خواردنێکت بۆ دروست بکەم، ئەویش مۆڵەتی دەداو ئیبلیس خواردنێکی زۆر خۆشی بۆ ساز دەکات، وەلەو کاتەدا خەڵك کەمتر گۆشتیان دەخوارد، بەڵام ئیبلیس لەسەر خواردنی گۆشت هانی دەدات تاکو بۆ خوێنڕێژیو ستەمکردن دڵڕەق بێ، وە لەخواردنی باڵندەوە ڕایدێنێ بەرەو خواردنی بەرخو مەڕو گا، وەسەرەنجام وای لێدێ بەبێ

---

[1] - (الطبري) بە (بیوراسب) و (أزدهاق) هێناویەتیو گوتوویەتی: (والعرب تسمّيه الضحاك فتجعل الحرف الذي بين السين والزاى في الفارسية ضاداً والهاء حاءً والقاف كافاً...)، ج١ ص٩٨، کەدیارە مەبەست لەو پیتەی لەنێوان (س) و (ز) دایە، پیتی (ژ)یەو بەو پێیە ناوی (ضحاك) لەبنەڕەتدا (ئەژدەهاك)ە کە ئەویش ناوی ماری سێ سەرەو شتێکی ئەفسانەییە، هەروەها (المسعودي) ناوی (ضحاك)ی بە (الدة آك) واتە: (دە دەرد) هێناوە، (مروج الذهب)، ج١، ص١٧٨.

[2] - (الثعالبي) گوتوویەتی: (وإنما سمي: بيوارسب، لأن بيور باللغة الفهلوية ما جاوز مائة ألف من العدد وكان له أكثر من مائة الف فرس ... فقولهم: بيوارسب، أي صاحب مائة ألف فرس)، الجذور الأسطورية للحمة نوروز الشعبية، ص٢١٣.

[3] - شاهنامە، ص٩.

[4] - الكامل في التأريخ، ج١، ص٧٧.

خواردنی گۆشت ناسرەوێ.

ئنجا ڕۆژێك پادشا پێی دەڵێ: تۆ خزمەتێکی زۆری منت کردوە پێم بڵێ: چ داواکارییەکت هەیە؟ ئەویش دەڵێ: هیچ پێویستییەکم نیە، مەگەر مۆڵەتم بدەی هەردووك شانەکانت ماچ بکەم و، ئەو شەرەفەم پێ ببەخشی ! ئەویش مۆڵەتی دەدات و لە فوو و جادووی خۆی تێیان دەکات و سەرەنجام دوو ماری ڕەش، یان دوو پارچە گۆشتی[1] لەسەر شانەکانی پەیدا دەبن، هەرگە دەبڕرێن وەك خۆیان پەیدا دەبنەوە.

دیارە پادشا ئازارێکی زۆری دەبێ و خواردن و خەوی لێ هەڵدەگیرێ و، لەوکاتەشدا ئیبلیس خۆی پەنهان دەکات و دەڕوات.

بەڵام پاشان کە پادشا دەکەوێتە پرسیارکردن لە پزیشکان و هیچ کەس پێی چارەسەر ناکرێ، دووبارە ئیبلیس لەشێوەی حەکیم و پزیشکێکدا دێتە لای و پێی دەڵێ: جگە لەمن هیچ کەس چارەسەرت نازانێ، ئەویش دەڵێ: ئەگەر چارەسەرم بکەی لە هەمووکەس لەلام بەڕێزترو بە قەدرتر دەبی، ئەویش پێی دەڵێ: تازە ئەو دوو مارە لە کۆڵت نابنەوە، بەڵام بەوە ئازارت نامێنێ، کە ڕۆژانە مێشکی دوو گەنجیان دەخوارد بدرێ، ئنجا دوو گەنج دەگرن و مێشکەکانیان دەخواردی مارەکان دەدرێ و، پادشا خەوی لێدەکەوێ و ئیسراحەت دەکات، بەڵام کە سبەینێ دووبارە مارەکان دەست دەکەنەوە بە هارو هاج، خەبەری دەبێتەوەو، بەو جۆرە ڕۆژانە دوو گەنج دەگیرێن و دەکوژرێن و

---

[1] - هەرکام لە (الطبري) و (ابن الأثير) دەڵێن: دوو پارچە گۆشت بوون نەك مار، بڕوانە: (تأريخ الأمم والملوك) ج١ ص٩٩، وە: (الكامل في التأريخ) ج١، ص٧٥، بەڵام (فيردەوسی) دەڵێ: دوو ماری ڕەش بوون، شاهنامە، ص٨ کە دەڵێ: (دوو مار سيه أزدو كتفش برست غمين / گشت وأزهر سوئى چارە جست).

مێشکەکانیان دەرخواردی مارەکانی سەرشانی زوحاك دەدرێ، پاشان ئیبلیس لە چێشتخانەی پادشا نامێنێ و دوو چێشتلێنەر (طباخ)ی بۆ پەیدا دەبن بەناوی: (ئەرمایل) و (کەرمایل) کە زۆر بەزەییان بەو گەنجانەدادێ کە ڕۆژانە دەبێ سەر ببڕێن و مێشکەکانیان دەرخواردی مارەکانی سەرشانی زوحاك بدرێن، بۆیە ڕێك دەکەون کە لەمەودوا یەکێك لە دوو گەنجەکە ئازاد بکەن و، لەجیاتی ئەوە مێشکی مەڕێك لەگەڵ مێشکی گەنجەکەی دیکە تێکەڵ بکەن، ئنجا کاتێك کە ژمارەی گەنجە هێڵراوەو ئازاد کراوەکان دەبوو بە دە (١٠)، هەندێك بزنیان تەسلیم دەکردن و، دەیانگوت بچنە شوێنی چیاوچۆڵ و، خۆتان لەئاوەدانیی بپارێزن و، بەو مێگەلە بزنە خۆتان بژیەنن.

ئیدی بەوشێوەیە بەردەوام بوون و دەکەس دە کەس ئەوانەیان بەڕێ دەکردو، مەڕومالّیان زۆر بوو، وەئەوانە بوونە بنەچەکە (أصل)ی هەموو کوردان.

(فیردەوسیی) لەوبارەوە گوتوویەتی:[1]

کنون کرد أز آن شحمه دارد نژاد    کز آباد بردل نبایدش یاد

واتە: کوردی ئێستا لەو بنەچەکەیەوە هاتوون، کە هەرگیز نابێ ئەوە لەدڵدا نەمێنێ و لەیاد بکرێ. لەولاشەوە خەڵك و جەماوەر ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بێزارتر دەبوون و دووعایان دەکرد ئەو (فەرمیدوون)ەی چاوەڕێی دەکەن دەرکەوێ، کابرایەکی ئاسنگەریش هەبوو بەناوی (کاوە) "سەرچاوە عەرەبییەکان دەڵێن: (کابي)"[2]، کە دوو کوڕی هەبوون یەکیان مێشکی کرا بۆ خۆراکی دوومارەکەی سەرشانی پادشاو، ئەوی دیکەشیان گیرابوو و چاوەڕێی سەربڕانی دەکرد، ئیدی

---

[1] - شاهنامە: ص٩.

[2] - تأريخ الأمم والملوك، ج١ ص١٠١،١٠٠، وە: الكامل في التأريخ، ج١ ص٧٥.

کاوە هاواری کردو خۆڵی بەسەر سەری خۆیدا کردو ئەو چەرمە کە لەکاتی ئاسنگەرییدا دەیکردە بەروانکە، بەسەری دارێکیەوە بەست و کردیە ئاڵا (عَلَم)و، پێش خەڵکەکە کەوت بەرەو لای کۆشکی پادشاو، خەڵکەکەش خرۆشاو شوێنی کەوتن و، سەرەنجام چووەلای ئەژدەهاك و قسەی زۆر توندی لەگەڵ کردو، پادشاش نەرمیی کێشاو کوڕەکەی بۆ بەردا.

پاشان کاوەی ئاسنگەرو کوڕەکەی کە ناوی (قارن) بوو، لەگەڵ ئاپۆڕای خەڵکەکە بەرەو ئەو شوێنە چوون کە (فەرەیدوون) لەترسی ئەژدەهاك خۆی لێ حەشاردابوو، وە هێنایانەدەرو بەڵێنیان پێدا کە فیداکاریی لەپێناودا بکەن، ئەویش فەرمانی کرد کە ئاسنگەران گورزی سەرەگا (گرز گاوسر)ی بۆ دروستبکەن و، کاوەش ئاڵایەکەی خۆی (درفش کاوە) لەپێش هەڵداو بەهەموویان هێرشیان کردە سەر کۆشکی ئەژدەهاك و پاسەوان و هاوکارەکانیان کوشت و، سەرەنجام فەرەیدوون ئەژدەهاکی بەدیل گرت و لەچیای (دباوند) زیندانیی کرد.

هەندێکیش گوتوویانە: فەرەیدوون لەڕۆژی نەورۆزدا کوشتوویەتی، وەك (إبن الأثیر) لەوبارەوە گوتوویەتی: (وبعض الفرس یزعم أن أفریدون قتله یوم النیروز فقال العجم عند قتله: إمروز نوروز، أي: استقبلنا الدهر بیوم جدید فاتخذوه عیداً وکان أسره یوم المهرجان)،[1] واتە: وە هەندێك لەفارسەکان پێیان وایە کە فەرەیدوون لەڕۆژی نەورۆزدا کوشتوویەتی، ئنجا عەجەمەکان لەکاتی کوشتنیدا گوتوویانە: {ئەمرۆ ڕۆژێکی نوێیە} واتە: بەڕۆژێکی تازەوە پێشوازیی ڕۆژگارمان کرد، بۆیە ئەو ڕۆژەیان کردە جەژن، وە ڕۆژی بەدیلگیرانەکەی ڕۆژی میهرەجان بوو.

---

[1] - الكامل في التأريخ، ج١ ص٧٦.

دەربارەی ماوەی حوکمڕانیی (فەرەیدوون)یش وەك (المسعودي) دەڵێ: پێنج سەد (٥٠٠) ساڵ بووە، هەروەها (فردوسي)یش هەمان شت دەڵێ[1].

ئەمە پوختەی بەسەرهاتی کاوەو ئەژدەهاك بوو، کە وەك گوتم: هەرکام لە: (الطبري) و (المسعودي) و (الثعالبي) و (فردوسي) (إبن الأثير)، هێناویانە، بەڵام (الطبري) و (المسعودي) و (إبن الأثير) بەکورتیی و (الثعالبي) و (فردوسي)یش بە درێژیی، وە من لە وردەکارییەکانییدا زیاتر پشتم بە کتێبەکەی (الثعالبي)[2] و پاشان (فردوسي)[3] بەستوە.

کە بەپێی قسەکەی (إبن الأثير) بێ، جەژنی نەورۆز لەو ڕووداوەوە داهاتوە.

**کەواتە:**

بۆنەی نەورۆز، یان پەیوەندیی هەیە بەگۆڕانکاریی کەش و هەوای ساڵ و دەربازبوون لە سەرماو زوقمی زستان و، چوونە نێو سەرەتای بەهارەوە، کەمایەی خۆشحاڵیی و شادمانیی دەربڕینی خەڵك بووە، بەتایبەت لەرۆژگاری زوودا کە هۆکارەکانی خۆپاراستن لەسەرماو سۆڵەی زستان، وەك ئێستا نەبوون و، چەندان کەس بەهۆی سەرماوە مردوون.

یاخود پەیوەندیی بە گۆڕانکارییەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە هەیە، کە بریتی بووە لە ڕاپەڕینی خەڵکێکی ستەمدیدەو خوێنمژراو و چەوسێنراوە، بە پێشڕەویی بابایەکی شۆڕشگێری جەرگ سووتاو بەناوی (کاوە)، لە دژی حوکمڕانێکی ستەمکاری خوێنمژو دڵڕەق بەناوی (ئەژدەهاك).

---

[1] - مروج الذهب..ج١ ص١٧٨، وە: شاهنامة، ص١٤.

[2] - تأريخ غرر السير، ص١٧–٣٩.

[3] - شاهنامە، ص٨-١٤.

# چەند ڕوونكردنەوەیەك

# لەبارەی نەورۆزو كاوە و ئەژدەهاك و فەرەیدوونەوە.

دەمەوێ ئەگەر بەكورتیی و گوشراویش بێ، ئاماژە بەچەند مەسەلەیەك بكەم لەبارەی ئەفسانەی (كاوەی ئاسنگەرو ئەژدەهاك)ەوە.

## یەكەم: ئەفسانەبوونی بەسەرهاتەكە، بێ بنەمابوونی ناگەیەنێ:

ئەوە ئێستاكە بۆتە ڕاستییەكی گرنگ لەلای مێژوو زانان، كە بەسەرهاتە ئەفسانەییەكان مەرج نیە هیچ ڕاستییەكی مێژووییان تێدا نەبێ، بەلام ئەوەندە هەیە خەیالی مرۆڤ كاری خۆی تێدا كردوون‌و، وەك كوردەواریی دەڵێ: (ترش‌و خوێی پێوەركردوون).

كەواتە: وا پێدەچێ كە بەسەرهاتی كاوەو ئەژدەهاكیش بنەمایەكی مێژوویی‌و واقیعیی هەبێ، بەڵام دوایی زیادەی خرابێتە سەر، بەتایبەت مارەكانی سەرشانی ئەژدەهاك شتێكی زۆر دوورە لەڕاستییەوەو، پێموایە مەسەلەی ئەو مارانە وایكردوە كە زۆر لەمێژوو زانان كۆی بەسەرهاتەكە ڕەتبكەنەوە، بۆ وێنە: (الیعقوبي) لەوبارەوە نووسیویەتی:

(فارس تدّعي لملوكها اموراً كثيرة مما لا يقبل مثلها من الزيادة في الخلقة حتى يكون للواحد عدة أفواه وعيون، ويكون للآخر وجهٌ من نحاس، ويكون على كتفي آخر حيّتان تطعمان أدمِغَة الرجال، وطول المدة في العمر...)[1]، واتە: گەلی فارس زۆر شتی وا كە عەقڵ قبووڵی ناكات بۆ پادشاكانیان لاف لێدەدەن، وەك زیادە لەجەستەدا، هەتا ئەوەی یەكیان چەندان زارو چاوی دەبن، وە یەكی

[1] - تأريخ اليعقوبي، ج١، ص١٣٧، ملوك فارس.

دیکەیان ڕووی لە مسە، وەلەسەرشانەکانی یەکی دیکەیان دوو مار هەن، کە مێشکی پیاوان دەخۆن، وە ماوەی درێژیی تەمەن...

## دوو: کاوە زوحاکی نەکوشتوە:

هەرچەندە وا باوە "بەتایبەت لەنێو کورددا" کە کاوە بەچەکوشەکەی سەری ئەژدەهاکی تەقاندوەو مێشکی پرژاندوە، بەڵام لەهیچ کام لەو سەرچاوانەدا کە من چنگم کەوتوون، ئەوەیان باس نەکردوە کە کاوە ئەو پادشایەی کوشتبێ، کەواتە: وا دیارە ئەوەش خەیاڵی کورد خستوویەتە سەر، ئەگەرنا ئەوەی لەسەرچاوەکاندا باسکراوە، ئەوەیە کە فەرمیدوون ئەژدەهاکی بەدیل گرتوەو لەچیای دەماوەند زیندانی کردوە، یان پاش گرتنی لەڕۆژی نەورۆزدا کوشتوویەتی.

## سێ: ئایا کاوە کورد بووە، یان پێش کوردانی شۆڕشگێڕ کەوتوە؟

هەرچەندە لەنێو ئێمەی کورددا ئەوە بڕاوەتەوە کە کاوەی ئاسنگەر کورد بووە، بەڵام لەسەرچاوەکاندا ئەو مەسەلەیە مشتو مڕی زۆری لەسەرە، کە لێرەدا بەکورتی ئاماژەیەکی پێدەکەین:

١- مێژووی نووسراوی ئێران، وەك (دکتۆر حەسەن کەریم جاف) گوتوویەتی: دەڵێ: ئەوەی زوحاکی کوشتوە (کۆڕش) بووە،[١] کە یەکێك بووە، لەپادشاکانی ئێران.

٢-مێژووی (بلعمي) دەڵێ: کاوە جوتیارێکی کورد بووە بۆ تۆڵە ستاندنەوەی

---

[١] - موسوعة تأريخ إيران السياسي، ج١ ص١٨.

دوو کوڕەکەی لەدژی زوحاك ڕاپەڕیوە.[1]

٣- بەپێی ئەفسانەکانی ئێرانیش، کاوە ئاسنگەرێکی ئەصفەهانیی بووە،[2] هەروەها هەرکام لە (الطبري) و (ابن الأثير) کە باسی کاوە دەکەن بە (کابي الأصفهاني) ناوی دێنن[3].

بەڵام دیارە بەپێی بەسەرهاتەکە، ئەوانەی لەسەر بڕان دەربازیان بووەو چوونەتە چیاو چۆڵ، بە بنەچەکەی گەلی کورد دادەنرێن، کەواتە:

کاوەی ئاسنگەریش زۆر نیزیکە کورد بووبێ‌و، سەرجەم ئەوانەش کە سەربڕاون، یان ڕزگاریان بووەو، پاشان لەوپادشا زۆردارە ڕاپەڕیون‌و شوێن کاوە کەوتوون، کورد بووبن‌و ئەو پادشا زۆردارە ئاوا چەوساندبنیەوە.

بەڵام بەڵگەیەکی دڵنیاکەریشمان بەدەستەوە نیە لەوبارەوە.

## چوار: ناگونجێ بۆ ساغکردنەوەی بنەچەکەی نەتەوەی کورد، پشت بە ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەر و پادشا ئەژدەهاك ببەسترێ:

بەڵێ بۆ ساغکردنەوەی ئەسڵ‌و بنەچەکەی کورد، کە بۆ ماوەی هەزاران ساڵ لەو شوێنەی کە ئێستا تێیدا دەژی، ژیاوە، هیچ پەکمان لەسەر ئەو ئەفسانەیە نەکەوتوەو، ئاشکراشە کە مەرج نیە نە نەتەوەی کوردو نە هیچ نەتەوەیەکی دیکەش، ڕیشەو خوێنێکی سەربەخۆی خۆی هەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە کورد لەمێژە نەتەوەیەکەو نیشتیمان‌و زمان‌و کلتوورو مێژووی خۆی هەیە،

---

[1] - هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕەی پێشوو، لە: (تأريخ بلعمي)، ص١٤٣.

[2] - هەمان سەرچاوەو بەرگ، وە: شاهنامە، ج١ ص١١.

[3] - تأريخ الأمم والملوك، ج١ ص١٠٠، وە: (الكامل في التأريخ) ج١ ص٧٥.

وەك هەر نەتەوەیەکی دیکە.

هەڵبەتە لەبارەی ڕیشەو بنچینەکەی کوردیشەوە قسەو باسی زۆرن و، زۆرێك لە شارەزایانی مێژوو لێکۆڵینەوەیان لەو بارەوە کردوە، کە پێم وایە لە لێکۆلەرانی کورد هەر کام لە: (دکتۆر حەسەن کەریم جاف) لە کتێبی (مَوسوعَة تَأرِیخ إیران السِیَاسِي)دا و(دکتۆر فرست مرعي) لە کتێبی: (الکرد وکردستان: جدلیة الأسطورة والتأریخ والدین) وە کتێبی: (کردستان في القرن السابع المیلادي)دا، لەو بارەوە توێژینەوەی باشیان کردوەو، پوختەی توێژینەوەکەشیان ئەوەیە کە میدییەکان (Medes) کە گەلانی هیندۆ ئۆرووپیی (الآریة)ین، وەك لە شوێنەواری ئاشوورییەکاندا هاتوە، چەند تیرەو هۆزێکی جۆراوجۆر بوون، کە یەکەیەکی سیاسیی کۆی نەکردوونەتەوەو، لە ڕۆژهەلاتی دەریای (قەزوێن)ەوە، لە دەوری سەدەی نۆی پیش زاییندا بەرەو لای (باختەریان)و ولاتی (میدیا) کۆچیان کردوەو، وردە وردە دەستیان بەسەر ولاتانی دەوروبەریاندا گرتوەو، پاشان وردە وردە گەلانی دیکەی وەك: گوتیی و لولوبیی و کاسیی و مانیی و کیمیریی و نیریی و کاردۆخیی، لەگەڵیان ئاوێتە بوون و بە هەموویان باب و باپیرانی نەتەوەی کوردیان پێکهێناوە.[1]

وە ئەمە لەمێژە ڕاوبۆچوونی زۆرێك لە مێژوو زانانی ناودارە، بۆ نموونە: (مینۆرسکیی)[2] و (محمد أمین زکی بگ)[1] و (دکتور شاکر خصباك)[2] و (توفیق

---

[1] - (الکرد وکردستان: جدلیة الأسطورة والتأریخ والدین)، ص٥١-٦، ط١:٢٠٠٦م، کاوە، وە: (کردستان في القرن السابع المیلادي)، ص١٩-٧٠ (تأریخ الکرد قبل الإسلام) وە: (موسوعة تأریخ إیران السیاسي)ج١ ص ٢١-٣٦، (المیدیون Medes) (٧٠٨ أو ٧٠١-٥٥٠ ق.م).

[2] الأکراد أحفاد المیدیین، فلادیمیر مینورسکي، مجلة: المجمع العلمي الکردي، ج١ العدد الأول

وَهْبي)[٣]، وەهەرکام لە دکتۆر حەسەن و دکتۆر فرسەتیش هەر پشتیان بەوان بەستوە بەتایبەت (مینۆڕسکیی).

دیارە میدییەکانیش لە ساڵی(٥٥٠ پ . ز) تاکو (٧٠٧ پ.ز) یان (٧٠١) حوکمیان کردوەو دەوڵەتەکەیان لە ماوەی ئەو سەدو پەنجاوحەوت (١٥٧)، یان (١٥٠) ساڵەدا، چوار پادشا حکومڕانییان کردوە، کە ئەمانەن:

١- دیاکۆس (Dyoks)

٢- فرائتورس (فرورتیس)

٣- هوخشترا (کی ئیخسار)

٤- ئیستیاك، ئیشتویکو (ضحاك).

وە دواین پادشایان کە زۆر نیزیکە هەر ئەژدەهاك (زوحاك)ەکەی ئەفسانەی کاوەو زوحاك بێ، لەسەر دەستی (کۆڕشی گەورە ) پادشای فارس و دامەزرێنەری پادشایەتیی ئێران (الشاهنشاهیة الإیرانیة) کە بە (ئەخمینییەکان و هەخامەنشییەکان) ناسراون، کۆتایی پێکهاتوە[٤].

شایانی باسیشە ئەوەی کە زۆر کەس وەك سەرەتای مێژووی کورد دەینووسن لێرەوە هاتوە، کە دەڵێن: ئێستا (٢٠١٢)ی زاینیو (٢٧١٢)ی کوردییە، واتە: دوو هەزارو حەوت سەدو دوازدە ساڵە دەوڵەتی میدیی دامەزراوە.

---

بغداد: ١٩٧٣، ص٥٦٠-٥٦٣.

[١] – خلاصة تأريخ كردو كردستان، ص٧٥.

[٢] – الكرد والمسألة الكردية، ص١٣.

[٣] – أصل الأكراد ولغتهم، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد الثاني، ص١-٢٤، ١٩٧٤.

[٤] – موسوعة تأريخ إيران السياسي، ج١، ص٢٢-٢٣.

هەرچەندە ئەگەر لە جیاتی (٧٠١) بڵێین: (٧٠٧) پ.ز، ئەو کاتە مێژووەکە ئاوای لێ دێ (٢٠١٨)ی کوردیی.

دیارە هەندێك کەسیش تێبینییان لەسەر ئەوە هەیە کە ئەو ساڵە بکرێتە مێژووی کورد، چونکە بوونی کورد لەوە لەپێشترە، یان لەبەر ئەوەی لەو مێژووەدا، میدییەکان دەوڵەتی ئاشوورییان ڕووخاندوە[١].

بەڵام وەنەبێ ڕیشەی بنەچەکەی کورد تەنیا بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەوڵەتی میدییەکان، بەڵکو وەك مێژووزانانی مێژووی کۆن گوتوویانەو لەسەری ڕێککەوتون: نەتەوەیەك بە ناوی: گوتییەکان (الگوتیین) دەوری دوو هەزار ساڵ (٢٠٠٠) پێش زایین لەو شوێنانەدا ژیاون، کە وڵاتی نەتەوەی کورد لەو ڕۆژگارەدا پێك دێنێ، وە گوتییەکان هەمیشە هەڕەشەیان لە ئاشوورییەکان کردوەو ئاشورییەکان بە گاردۆ (Gardo) ناویان بردوون[٢].

**پێنج : دەگونجێ کاوە و فەرەیدوون فارس و ئەژدەهاکیش کورد بووبێ :**

ئەمیش بیرۆکەیەکە کە ئەگەر مەبەست لە {ئەژدەهاك (ضحاك)} هەمان پادشا {ئیستیاك (ئیشتیوکو)} دوا حوکمڕانی دەوڵەتی ماد بووبێ، دیارە دەبێ (فەریدوونیش) هەمان (کۆڕشی گەورە) دامەزرێنەری زنجیرەی پادشایەتیی هەخامەنشیی، یان ئەخیمینی ئێران بووبێ، ئنجا کاوەش، یان هەر فارس و خزمی فەرەیدوون بووەو لە نەوەی (پیشدادییەکان) بوون "کە ڕەنگە ئەسڵ و بنەچەکەی دووری فارس و کورد بووبن" یان کورد بووەو هاوکاری فەرەیدوون

[١] - بڕوانە: بە دەم ڕێگاوە گوڵچنین، نۆشیروان مستەفا ئەمین، لاپەڕە (١٢) چاپی دووەم:٢٠١٢.

[٢] - موسوعە تأریخ إیران السیاسی، ج١، ص٢٧.

(کۆڕش)ی کردوە![1]

هەڵبەتە ئەم بیرۆکەیەش کەسانێك لە شارەزایانی مێژوو دەیزانن، بەلاّم کەمتر بیستراوە باسی بکەن، لەبەر هەستو نەستی گشتی کورد، کە هەر بەو جۆرەی کە باوە لە ئەفسانەی کاوەو زوحاك گەیشتوون، بەلاّم من بە باشم زانی کە ئاماژەیەکی هەر پێبکەم.

دیارە لە حاڵەتی سەلمێنرانی ڕاستیی ئەو بیرۆکەیەشدا، تا ڕاددەیەك ئیشکال بۆ نەورۆز وەك یادو جەژنێکی نەتەوەیی کورد دروست دەبێو، پێم وایە هەر ئەوەشە زۆر کەسی لە گوتنی ئەو قسەیەو دەرخستنی ئەو بیرۆکەیە دوورخستۆتەوە !!

## دووەم : تێڕوانینی زانایان بۆ جەژنی نەورۆزو مامەڵەی حوکمڕانانی دەوڵەتی ئیسلامیی لەگەڵیدا ، جۆراوجۆر بووە.

وەك لە خاڵی یەکەمدا خستمانەڕوو، هۆکارو چۆنیەتی پەیدابوونی بۆنەی نەورۆز وەك جەژنێك، لە نێو شارەزایانی مێژوودا، مشتومڕو ڕاجیایی لەسەرەو، بە گشتی دوو بۆچوونی سەرەکی لەبارەوە هەن:

یەك: پەیوەستە بە کەشو هەوای ساڵەوەو، کۆتایی پێهاتنی وەرزی زستانو سەرماو سۆڵەکەیو، دەست پێکردنی وەرزی بەهارو هەوا خۆشو فێنکەکەی.

دوو: پەیوەستە بە بارودۆخی سیاسییو کۆمەلاّیەتییو، کۆتایی پێهێنانی ڕژێمێکی ستەمکارو نەهێشتنی حوکمڕانێکی خوێنمژو خراپەکار.

---

[1] - هەندێك لەمێژوونووسان دەڵێن: کۆڕشی یەکەم نەوە (کوڕی کچ)ی ئیستیاك (Austuges) بووە، بڕوانە: (الكرد وكردستان: جدلية الأسطورة والتأريخ والدين) ص١٠١.

ئەوە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە ڕۆژی نەورۆزدا لە نێو ئەو گەلانەدا کە یادیان کردۆتەوە، چەند هەڵسوکەوتێکی جۆراو جۆر کراون، بۆ نموونە:

١- ئاگر کردنەوە.

٢- دیاریی و شیرینی بەخشینەوە.

٣- باج و پیتاك کۆکردنەوە بۆ حکومڕانان.

٤- چوونە دەر لە ماڵ بۆ گەشت و سەیران.

ئاشکراشە هەر کام لەم هەڵسو کەوت و ڕەفتارانە دەگونجێ بە شێوازێکی شەرعیی و بۆ ئامانجی ڕەواو پەسند بکرێن و، دەشگونجێ بە پێچەوانەوە بە شێوازی خراپ، یان بۆ ئامانجی هەڵەو ناشەرعیی بکرێن، کە دیارە ئەوەش دەبێتە مایەی ڕاجیایی زانایان و، جۆراوجۆر بوونی هەڵسوکەوت و مامەڵەی حکومڕانان، لەگەڵ ئەو جەژن و بۆنەیەدا.

بۆ نموونە:

١- (عومەری کوڕی خەتتاب) "خوا لێی ڕازی بێ" لە سەردەمی حکومڕانیی خۆیدا ئەو عادەتەی پادشاکانی فارسی لەو وڵاتانەی لە ژێر دەستیان دابوو، کە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی دیاریی و پیتاك لە هەردوو ڕۆژی: نەورۆزو میهرەگاندا، هەڵوەشاندەوە[1]، بەڵام موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان خوا لێی خۆشبێ لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی خۆیدا، فەرمانی کرد کە ئەو دیارییانەی بۆ کۆبکرێتەوە، بەو جۆرە لە نەورۆزو میهرەجاندا دەهەزار (١٠٠٠٠) درەمی بۆ کۆ

---

[1] - تأريخ الحضارة العربية الإسلامية، وزارة التربية (١٩٨٢) بغداد، ص١١٤، لە (کاوەو نەورۆز...) لاپەڕە: ٤٧.

دەکرایەوە[1].

دیــارە ئــەوە هــەر بــەردەوام بــووە، تــاکو ڕۆژگــاری (عومــەری کــوڕی عەبدولعەزیز) "خوا لێی خۆشبێ"، کە ئەو عادەتەی هەڵوەشاندەوە[2].

٢- لــە (عَبْـدِ اللّـهِ بْـنِ عَمْـرَ) "خــوا لێیــان ڕازی بــێ" گێڕڕاوەتــەوە کــە گوتوویەتی: {مَنْ بَنَى بِبِلاَدِ الأَعَاجِمِ فصَنَعَ نَيْرُوزَهُمْ وَمِهْرَجَانَهُمْ، وَتَشَبَّهَ بِهِمْ حَتَّى يَمُوتَ وَهُوَ كَذَلِكَ، حُشِرَ مَعَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ فِي السُّنَنِ الكبرى (٢٣٤/٩)) واتــە: هــەر کــەس لــە وڵاتــی عەجەمانــدا نیشــتەجێ بــێو نــەورۆزو میهرەجانی ئەوان بکاتو، خۆی بەوان بچوێنێو هــەتا دەمــرێ ئــاوا بمێنێتــەوە، لە قیامەتێ لەگەڵ واندا حەشر دەکرێ.

٣- بەڵام هەر لەوبارەوە (إبـن سـيرين) هەڵوێستێکی دیکە لـە (علي بـن أبـي طالب) "خوا لێی ڕازی بێ" دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (أُتِيَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بِهَدِيَّةِ النَّيْرُوزِ فَقَالَ: مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ! هَذَا يَوْمُ النَّيْرَوزِ، قَالَ: فَاصْنَعُوا كُلَّ يَــوْمٍ فَيْـرُوزاً، قَــالَ أَبُـو أُسَـامَةَ: كَـرِهَ أَنْ يَقُـولَ نَيْـرُوزاً}(رَوَاهُ البَيْهَقِــيُّ فِي السُّـنَنِ الكبرى، كتاب الجزية: (١ /٥٤٨))، واتە: دیاریی نەورۆزیان بۆ عــەلی "خــوا لێــی ڕازی بێ" هێنا "ئەو کاتەی خەلیفە بووە لە شاری کووفە" گوتی: ئەمە چییە؟ گوتیان: ئەی فەرماندەی بڕواداران! ئەوە بە بۆنەی ڕۆژی نەورۆزەوەیە، گوتی: هــەموو ڕۆژێــك فــەیرۆزێك بکــەن، ئــەبو ئوســامە "کــە یەکێکــە لــە ڕاوییــەکان" گوتی: عەلی "خوا لێی ڕازی بێ" حەزی نەکرد بڵێ: نەیرووز.

[1] – تأريخ اليعقوبي،ج٢، ص١٥٢،١٥١.

[2] – هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢١٤.

بەلام من دەڵێم: هیچ جیاوازیی لە نێوان ئەو دوو وشەیەدا نیەو، وا پێدەچێ عەلی هەر گوتبێتی نەیرووزو یەکێك لە ڕاوییەکان لێی گۆڕابێ، یان هەر لە بنەڕەتەوە عەلی "خوا لێی ڕازی بێ" بە (فیروز)[1] لە وشەکە حاڵی بووبێ، نەك بە (نیروز)، وە من پێموایە ئەوە جۆرێك بووە لە قسەی خۆش و هاندانی خەڵکەکە لەسەر دیاریی بەخشینەوەیان لەو ڕۆژەدا، واتە: هەموو ڕۆژێ دیاریی ببەخشن، هەڵبەتە قسەکەی (إبن عمر)یش مەبەست پێی بەشداریی کردنی عەجەمەکانە لە یادو بۆنەکانیاندا، بەو پاڵنەرو ئامانجانەی کە ئەوان هەیانن و، چاولێکردنیان لەو شتانەدا کە تایبەتمەندیی ئایینییانن، وەك پێشتر لە بەشی دووەمدا باسمان کرد.

٤- هەروەها مەسەلەی ئاگر تێداکرانەوەی ڕۆژی نەورۆز، یەکێکی دی بووە لە هۆکارەکانی ڕاجیایی زانایان لەبارەیەوەو، ئەوانەی کە پێیان وا بووە ئاگر کردنەوەکە بە هاندەری بە پیرۆزگرتن (تقدیس)و پەرستنی ئاگرە، ڕێگرییان لێکردوەو، ئەوانەش کە بەشتێکی ئاسایی و وەك هێمای دەربازبوون لە سەرماو زوقمی زستان یان قوتاربون لە زستانی ستەمکاریی و چەوساندنەوە تەماشایان کردوە بەلایانەوە شتێکی ئاسایی و ڕێ پێدراو بووە.

٥- هەڵبەتە پاش ئەوەش کە خەڵکی لە ڕۆژگاری ئاگر پەرستیی مەجووسییەکان دوور کەوتوونەتەوە، مەسەلەی یادی نەورۆز بۆتە شتێکی ئاسایی، بە بەڵگەی ئەوە کە:

---

[1] - بەلام (د. فرست مەرعیی) دەڵێ: (فیروز) هەر وشەی (پیرۆز)ی فارسی و کوردییەو، چونکە لەزمانی عەرەبییدا پیتی (پ) نیە، کردوویانە بە (ف)و، عەلی "خوا لێی ڕازی بێ" بۆ پیرۆزبایی وایگوتوە، ئەگەرنا بەڕوونیی دەیگوت: ئەوکارە مەکەن، بڕوانە: (الکرد وکردستان: جدلیة الأسطورة والتأریخ والدین) ص٦٩.

يەك: لە ڕۆژگاری ئومەویی و عەبباسیی و عوسمانییەکاندا، گرنگیی بەو جەژنە دراوەو یاد کراوەتەوە[1]، (پیرەمێرد) شاعیری گەورەی کورد لە بارەی گرنگیی دانی دەوڵەتی عوسمانیی بە جەژنی نەورۆزەوە، گوتوویەتی:

(بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا لە ئەستەمبوڵ جەژنی نەورۆزم دی، ئەم ڕۆژە لێرە بە جەژنێکی پیرۆز دادەنرا، هەموو ساڵێك لە (٩)ی مارتدا کاربەدەستان تێکڕا دەستە دەستەو پۆل پۆل ئەهاتنە سەراو کۆشك بۆ پیرۆزبایی کردن لە سوڵتان، شەربەتیان دەخواردەوە، لە گشت منارەکانی مزگەوتیش مۆم و قوتیلە دائەگیرسا، دوای بیست و سێ ساڵ کە لە ئەستەمبول فەرمانبەر بووم، لە ساڵی (١٩٢٦)دا گەڕامەوە بۆ سلێمانی...)[2].

دوو: وەك خاوەنی کتێبی (الجذور الأسطورية لملحمة نوروز الشعبية) لە بەشی (نوروزيات)دا گوتوویەتی: (إبتهج وَأشَادْ عُلَماء وَشُعَراء وَ رِجَال دِين وَمتصَوِّفَة مُسْلِمون مِنْ مُختَلف الشعُوب بعيد النوروز، وَاحتفوا بِه وَخَلَّدوهُ برسائلهم و أشعارهم وممارساتهم)[3]، واتە: زاناو شاعیرو صۆفییانی مسوڵمان لە گەلانی جۆراوجۆر دڵخۆشیی و شادییان بە بۆنەی نەورۆزەوە دەربڕیوەو گرنگییان پێداوە، بە نامەکانیان و بە شیعرەکانیان و ڕەفتارەکانیان.

کەواتە: بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیی، کەم و زۆر گرنگیی بە جەژنی نەورۆز دراوەو یاد کراوەتەوەو، هەندێك لە کاربەدەستان و زانایانیش کە هەڵوێستی نەرێنییان لە بەرانبەریدا هەبووە، هۆکارەکەی کاردانەوەیان

---

[1] - کاوەو نەورۆز لە نێوان ئەفسانەو ئاییندا، لاپەڕە: (٤٨،٤٩،٥٠).

[2] - هەمان سەرچاوە لاپەڕە: ٥٠.

[3] - بڕوانە: ص٢٣٥ ، کە سەرو پارچە شیعری بە فارسیی و تورکی لە هەرکام لە (الشيخ عبدالرحمن الطالباني -خالص-) و (الشيخ عبدالقادر بن عبدالرحمن -خالص-)وە هێناوە.

بـووە بـۆ شـێوازو ئامـانجی نـاڕەواو خراپـی یادکردنەوەکـە، یـاخود ئـەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارە هەڵەو ناشەرعییانەی کە تێیدا ئەنجام دراون.

ئەوانەش کە هەڵوێستیان ئەرێنیی (إيجابي)و ئاسایی بووە، لەبەر ئەوە بـووە کـە لـە بنەڕەتـدا بـە ڕەوا (مباح)یـان زانیـوەو، لـە شـێوازو ئامـانج و چۆنیەتیەکەشییدا هیچ ناشەرعییەکیان نەدیوە.

## سێیەم: ئاگر کردنەوەی ڕۆژی نەورۆز و ئاگری بەردەوامی ئاگرپەرستەکان، دوو شتی جیاوازن:

هەرچەندە بە جەژن و بۆنەیەکی نەتەوەیی دانانی نەورۆزو، ئاگر کردنەوە لەو ڕۆژەدا، دوو شتی پێکەوە پەیوەست و لێك بەستراو نین و، دەگونجێ بەبێ ئاگر تێدا کردنەوە، نەورۆز وەك بۆنەو جەژنێکی نەتەوەیی دابنرێ، بەڵام پێویستە بشزانرێ، کە ئاگر کردنەوە لە ڕۆژی نەورۆزدا، کە لە ساڵێدا جارێکە لە ڕۆژی (٣/٢١)دا، زۆر جیاوازە لە ئاگرکردنەوەی مەجوسییەکان، کە پێویستە چوار وەرزی ساڵ و بگرە شەوڕۆژ ئەو ئاگرە بئایسێ و نەکوژێتەوە، پاشان پێویستە ڕێزی لێ بگیرێ و سەجدەو ڕکووعی بۆ ببردرێ.

چونکە شتێکی ئاشکرایە لە مێژووداو ئێستاش، کە ئاگر پەرستەکان بە هەر نرخێك بووە، ناهێڵن ئاگرەکەیان بکوژێتەوەو، کەسانێکی تەرخانکراو هەن بۆ پاراستنی ئەو ئاگرەو هەمیشە خۆشکردنی و داگیرساندنی، کە پێیان گوتراوە: (الهرابذة)، کە تاك (مفرد)ەکەی (هَرْبَذ)ە، وەك (الطبري) لە بارەی یەکێك لە پادشایەکانی فارس بە ناوی (بشتاسب) نووسیویەتی: (..وقيل إنه ابتنى بفارس مدينة (فسا) وببلاد الْهند وغيرها بيوتاً للنيران ووكل بِها الهرابذة...)[1] واتە: وە گوتراوە لە وڵاتی فارس شاری (فسا)ی بنیاتنا، وە لە شارەکانی هیندو هی دیکەشدا، خانووی بۆ ئاگران دروست کردن، وە هەڕابیزەی ڕاسپاردن کە ئاگادارییان بکەن و سەرپەرشتییان بکەن..

---

[1] - تأريخ الأمَمْ والْمُلوكْ، ج١، ص٢٩٣.

هەروەها (المسعودي) لە بارەی ئاگرێکەوە کە لە ڕۆژگاری وی دا هەبووە، لە شاری (دارَابجَرْدَ) لەسەر زەمینی فارس، دەڵێ: (وهذه النار تُسَمَّى في وقتنا هذا – وهو سنة اثنتين وثلاثين وثلثمائة (٣٣٢)– آزرجوى، وتفسير ذلك نارُ النَّهر، وذلك أنَّ آزر أحد أسماء النار (وجوى) أحد أسماء النهر بالفارسية الأولى، والمجوس تُعَظِّم هذه النار مالا تعظِّم غيرها من النيران والبيوت.

وذكرت الفرس أن (كيخسرو) لما خرج غازيا إلى الترك سار إلى خوارزم، فمرَّ على تلك النار، فلما وجدها عَظَّمها وسجد لها، ويقال: إنَّ (أنو شروان) هو الذي نقلها إلى (الكاريان)، فلما ظهر الإسلام تخوَّفتِ الْمَجُوس أن يُطْفِئَهَا المسلمون فتركوا بعضها بالكاريان، ونقلوا بَعْضَها إلى (نَسا) و(البيضاء) من كورة فارس، لتبقى إحداهُمَا إنْ طُفِئَتِ الأخرى ...)[1]، واتە: وە ئەم ئاگرە لەم ڕۆژگارەماندا "کە ساڵی سێ سەدو سیو دوو (٣٣٢)یە" پێی دەگوترێ: ئازەرجەوا، مانای ئەوەش (ئاگری ڕووبار)ە، چونکە (ئازەر) یەکێکە لە ناوەکانی ئاگر، وە (جەوا)[2] بە زمانی فارسیی پێشوو یەکێکە لە ناوەکانی ڕووبار، وە مەجووسییەکان ئەوەندەی ئەم ئاگرە بە گەورە دەگرن، هیچ ئاگروماڵێکی دیکەی ئاگر هێندە بە گەورە ناگرن.

وە فارس باسیان کردوە کە کاتێك کەیخوسرەو[3] بۆ جەنگ لە دژی تورك دەرچوو بەرەو خوارەزم چوو، وە بە لای ئەم ئاگرەدا ڕەتبوو، کە بینی بە گەورەی گرتو سەجدەی بۆ برد، وە دەگوترێ: کە ئەنۆشێروان ئەو ئاگرەی

[1] – مروج الذهب: ج٢، ص٥٠٢.

[2] – ئێستاش وشەی (جۆ) و (جۆگا) بۆ ڕووباری گچکە بەکاردێ.

[3] – کەواتە: کەیخوسرەو فارسەو ئێمە نەوەی وی نین، وەك سروودەکەی (دڵدار) "ئەی ڕەقیب"دەڵێ: {ئێمە ڕۆڵەی میدیاو کەیخوسرەوین}!!

گواستۆتەوە بۆ ئەلکاریان، جا کاتێك ئەهلی ئیسلام زاڵبوون، فارسەکان ترساون کە مسوڵمانان ئەو ئاگرە بکوژێننەوە، بۆیە هەندێکیان لە ئەلکاریان جێهێشتوەو، ئەوی دیکەشیان بۆ (نەسا) و (ئەلبەیزاء) لە هەرێمی فارس ڕاگواستوە، تاکو ئەگەر یەکیشیان کوژایەوە ئەوی دیکە هەر بمێنێ...

وەك دەبینین ئاگری مەجووسییە ئاگر پەرستەکان، دەبێ هەمیشە بئایسێ‌و نەکوژێتەوە، پاشان دەبێ بە گەورە بگیرێ‌و سەجدەی بۆ ببردرێ!

ئنجا شایانی باسیشە کە کاتی خۆی ئاگر پەرستەکان زۆریان گرنگیی‌و بایەخ بە خانووەکانی ئاگران (بيوت النيران)داوە، کە فارس بە خانووی ئاگریان گوتوە (آتشگده)، وەك (المسعودي) لەو بارەوەو لە ژێر ناوونیشانی: (ذكرالأخبار عن بيوت النيران وغيرها)دا گوتوویەتی: (رأيهم في النار والنور: فأما بيوت النيران ومن رَسَمَها من ملوك الفرس الأولى والثانية، فأول ما يُحكى ذلك عنه: أفريدون الملك، وذلك أنه وجد ناراً يُعَظِّمُهَا أهلها، وهم مُعتكفون على عبادها؟ فسألهم عن خبرها ووجه الحكمة منهم في عبادها، فأخبروه بأشياء اجتذبت نفسه إلى عبادها، وأنها واسطة بين الله وَخَلْقِهِ، وأنَّها من جنس الآلهة النورية...

جملة من بيوت النار:

وبيوت النيران كثيرة مِمَّا بَنَتْهُ الْمَجُوس بالعراق وأرض فارس وكرمان وسجستان وخراسان وطبرستان والجبال وأذر والران، وفي الهند والسند والصين...)[1].

واتە: ڕایان (واتە: ڕای فارسە مەجووسییەکان) لە بارەی ئاگرو ڕووناکییەوە: یەکەمین کەس کە خانووەکانی ئاگرانی دانان، لە پادشایەکانی فارسی یەکەم‌و دووەم، فەریدوون پادشا بوو، ئەویش ئەوە بوو کە ئاگرێکی بینی، خەڵکەکەی

[1] - مروج الذهب: ج٢، ص٥٠١ و ٥٠٦.

بە گەورەیان دەگرت و پەرستنیان بۆ ئەنجام دەدا، ئەویش لەبارەیەوە پرسیاری لێکردن: کە ئایا حیکمەت لە پەرستشیاندا بۆی چییە؟

ئەوانیش هەندێك شتیان پێگوت، کە بوو بە مایەی پەلکێش کردنی بۆ پەرستنی، وە پێیان گوت: کە ئاگر هۆکاری نێوان خواو دروستکراوەکانیەتی، وە کە ئاگر لە ڕەگەزی پەرستراوە نوورانییەکانە...

چەند خانووێکی ئاگر:

...وە ئەو خانوانەی کە مەجووسییەکان لە عێراق و سەر زەمینی فارس و کەرمان و سەجستان و خوراسان و طەبەرستان و جیبال و ئازەربایجان و ڕان، وە لە هیندو سەندو چین، زۆرن...

کەواتە: ئاگری ئاگر پەرستەکان چەند سیفەتێکی تێدا بوون، کە جیای دەکەنەوە، نەك هەر لە ئاگر کردنەوەی ڕۆژی نەورۆز، بەڵکو لە هەر جۆرە ئاگرکردنەوەیەکی دیکە، کە ئەمانەن:

(١)- ئاگرێکی بەردەوام بووەو، نەدەبوایە لە هیچ کاتێکی شەوو ڕۆژدا بکوژێتەوە.

(٢)- چەند خانوو و شوێنێکی تایبەت و تەرخانکراوی بوو ون، کە دەبوایە تەنیا لەو شوێنانەدا بکرێتەوە.

(٣)- کەسانێك دامەزراون بەدیار ئەو ئاگرەوە، کە سەرپەرشتیی بکەن و هەمیشە دایگیرسێنن و نەهێڵن بکوژێتەوە، کە پێیان گوتراوە (هەرابیذە).

(٤)- دەبوایە ئەو ئاگرە پەرستشی بۆ بکرێ و، سەجدەو ڕکووعی بۆ ببردرێ و بە گەورە بگیرێ.

بەڵام بێگومان ئاگرکردنەوەی نەورۆز، هیچ کام لەم سیفەتانەی تێدا نین، کەواتە: لە یەك جیاوازن و ناگونجێ وەك یەك سەیر بکرێن.

ئنجا بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونییش، بە پێویستی دەزانم سەرنجێکی پێناسەی ئایینی مەجووسیی (الديانة المجوسية) بدەین:

لە (الموسوعة العربية)دا لە بارەی (المجوسية)ەوە هاتوە، کە من یەکسەر دەیکەمە کوردیی:

{(المجوسية): مەجووس (Magi) وشەیەکی فارسییە، بۆ شوێنکەوتوانی ئایینی زەردەشتایەتیی بەکارهاتوە، ئەویش بریتیە لە ئایینێکی بتپەرستانەی دوانە (ديانة وثنية ثنوية) کە دەڵێ: دوو پەرستراو (إله) هەن، یەکەمیان پەرستراوی چاکە، یان ڕووناکیی: ئەهورامەزدا (Ahura Mazda)، وە دووەمیان پەرستراوی خراپەو تاریکیی: ئەهریمەن (Ahuraman)، وە زانایان ڕاجیاییان هەیە لەبارەی هۆکاری ناونرانیەوە، گوتراوە: پاڵدراوەتە لای پیاوێك کە ناوی مەجووسن بووە، یان لای تیرەیەکی فارس، کە پێی گوتراوە: ماگان (Magan).

وە بەشێك لە زانایان دەڵێن: مەجووسییەت پێش زەردەشتایەتیی بووە، بەڵام زەرادەشت (Zoroaster) دیاریکردوەو ئاشکرای کردوەو لێی زیادکردوە.

وە سەرچاوەکان باس دەکەن، کە دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانیی: ئەردەشیر (Artaxerxer)ی یەکەم زەردەشتایەتیی کردە ئایینی فەرمی دەوڵەتەکەی، پاش جێگیربوونی کاروباری لە نێوان ساڵەکانی (٢٢٤پ ز، تاکو ٢٤١)، وە فەرمانی کرد بە کۆکردنەوەی بنچینەکانی کتێبی پیرۆز کە ئاوێستایە، یان ئەڤێستا (Avesta)یە...

وە بە پیرۆز گرتنی ئاگر شتێکی ئاشکراو دیارە لە زەردەشتایەتییدا...،

وە پیاوانی ئایینی زەردەشتایەتیی پێیان دەگوترێ: موبیدەکان، کۆی (موبيذ)، وە هەرکامیان سەرپەرشتی کۆمەڵێك دەکات، کە پێیان دەگوترێ:

هەربەنەگان کۆی (هەربەذ) کە خزمـەتی ئـاگری پەرسـتگا دەکـەن، چونکە گەورە پیاوانی ئـایینی (زەردەشـتایەتیی) زۆر سـووربوون لەسـەر ئـەوە، کـە بڵێسـەکانی ئـاگر لـە پەرسـتگا گـەورەکان و مەزارگـە بچـووکەکانیاندا نەکوژێتەوە.}[1]

دیارە بە سەرنجدانی ئـەم پێناسـەیەی مەجووسییەت و ئـاگر پەرسـتیی، وەك مانگی چواردە دەدرەوشێتەوە، کە ئاگری نەورۆز زۆر جیـاوازە لـە هـی ئاگرپەرستیی و هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نیە.

کۆتایی ئەم خاڵەش بـە دوو قسـەی دوو لـە نووسـەرو شـارەزایانی کـورد دێنم کە لەبارەی ئاگر کردنەوەی نەورۆزەوە کردوویانە:

یەکەم: (محمد أمین زکی بگ) گوتوویەتی:

{نـەورۆز: جـەژنی ئاتـەش پەرسـتیی نیـە، نابێـت تـەفسیرێکی بـێ ڕێ و جێی بدرێتێ}[2]

دووەم: (پیرەمێردی شاعیر) گوتوویەتی:

{ئـاگرێ کـە خـۆم بیکەمـەوەو بتـوانم بیکوژێنمـەوە، کـێ بـاوەڕ دەکـات بیپەرستم !}[3].

## چوارەم : حوکمی یادکردنەوەی نەورۆز

---

[1] - الموسوعة العربیة،ج١٧، ص٨٤٦.

[2] - بڕوانە: ڕۆژنامەی (گەلاوێژ) ژمارە (١)، ساڵی (١٩٤٣)ز، لە (کاوەو نەورۆز...) لاپەڕە (٤).

[3] - بڕوانە ڕۆژنامەی (ژین) ژمارە (٨٢٠)، ساڵی (١٩٢٧ز)، لە (کاوەو نەورۆز...) لاپەڕە (٤).

## لەبەر ڕۆشنایی عادەت و باوو هەل و مەرجی ئێستایدا دیاریی دەکرێ:

مەبەستم لەو ناوونیشانە ئەوەیە کە ئەگەر گریمان یادکردنەوەی نەورۆز کاتی خۆی ڕەگ و ڕیشەیەکی کوفرو شیرکیشی بووبێ، وە ئاگر کردنەوەش لە ڕۆژی نەورۆزدا ئامانج لێی بە پیرۆز دانان و بە گەورە گرتن (تقدیس و تعظیم)ی ئاگریش بووبێ "کە واش نیە وەك لە خاڵی سێیەمدا ڕوونمان کردەوە" ئەوە دیسان نابێتە بەلگەی قەدەغە بوونی یادکردنەوەی نەورۆزو ئاگر تێداکردنەوەی، چونکە:

وەك پێشتریش لە بنەمای(١٠)یەمدا خستمانەڕوو و چەند قسەیەکمان لە(القرافي)یەوە هێنان "کە دوای تۆزێکی دیکە دووبارە ئەوانیش و چەند قسەیەکی دیکەش دێنین" ئەو مەسەلانەی کە حوکمەکەیان لەسەر بناغەی عورف و باوو هەلومەرجێك بنیات دەنرێ، هەر کات ئەو عورف و باوو هەل و مەرجە گۆڕا، دەبێ ئەو حوکمەش بگۆڕێ، بە گوێرەی باو و هەلومەرجی پەیدابوو، ئەگەرنا تووشی هەڵەو ستەم دەبین.

ئێستاش با سەرەتا قسەکانی (القرافي) کە پێشتریش هێناومانن و، چەند قسەیەکی دیکەشی و چەند قسەیەکی (إبن عابدین)یش بێنین، پاشان چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو بنچینە شەرعییە، بەسەر مەسەلەی نەورۆزدا دەخەینە ڕوو:

(القرافي) گوتوویەتی: {إنَّ إجراءَ هَذِهِ الأَحْكام التي مُدْرَكُهَا العَوائد مع تَغيّرُ تلك العوائد، خلاف الإجماع وجهالة في الدين، بل كل ما هو في الشريعة يَتْبَعُ العَوَائِدَ، يتغيَّرُ الْحُكْم فيه عند تغيّر العادة إلى ما تقتضيه العادة المُتَجَدِّدَة...}[١]، کە

[١] - (الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرُفات القاضي والإمام) ج١٨، ص٢١٩.

پێشتر بە درێژیی هێنامان و ماناشمان كرد، بۆیە لێرەدا ماناكردنەكەی دووبارە ناكەینەوە.

هەروەها (القرافي) لە كتێبێكی دیكەیدا هەر لەو بارەوە گوتوویەتی:

{لاتَجْمُدْ عَلى المسطور طُول عُمرَكْ، بَلْ إذَا جَاءَك رَجُلٌ مِنْ غَيرِ أَهلِ إقلِيمك يَستَفتِيك لا تُجرِه عَلى عُرْفِ بَلَدِك واسألهُ عَنْ عُرْفِ بَلَدِهِ، وَأَجْرِهِ عَلَيهِ وَافْتِهِ بِهِ دونَ عُرْفِ بَلَدِك وَالمُقرَّرِ في كُتُبِك، فَهَذَا هُوَ الحَقُ الواضِحْ، والجُمُود عَلى المَنقولات أَبَداً، ضَلالَ في الدِّينْ وَجَهْلٌ بِمَقاصِد عُلَماء الْمُسلمِينَ وَالسَّلَفِ الماضِينْ}[1].

واتە: بە درێژایی تەمەنت خۆت لەسەر شتی نووسراو مەهێڵەوە، بەڵكو هەركات پیاوێكی غەیری ناوچەكەی خۆت هاتە لات و پرسیاری شەرعیی لێكردی، بە پێی عورف و باوی دەڤەرەكەت وەڵامی مەدەوەو، لە بارەی عورف و عادەتی شوێنەكەی خۆیەوە پرسیاری لێ بكەو، بە پێی ئەوە قسەی لەگەڵ بكەو فەتوای بۆ بدە، نەك عورف و باوی شوێنەكەی خۆت و ئەوەی لە كتێبەكانتدا بڕیاری لەسەر دراوە، ئا ئەوە هەقی ڕوونە، وە بەردەوام مانەوەو وشك بوون لەسەر قسەو فەتوایە نەقڵ كراوەكان، گومڕاییە لە ئاییندا و نەشارەزاییە بە ئامانج و مەبەستەكانی زانایانی مسوڵمان و پێشینی ڕابردوو.

هەروەها (إبن عابدين)یش هەر لەو بارەوە گوتوویەتی:

(كَثِيرُ مِنْ الأَحكَامْ تَختَلَفُ بِاَختِلافِ الزمَانْ لِتَغَيُّرُ عُرفُ أَهلِهِ، أَوْ لِحَدوثْ ضَرورَة أَوْ لِفَسَادْ أَهلْ الزمَانْ، بُحيثَ لَوْ بَقِي الحُكمْ عَلى مَاكَانَ عَلَيهِ اَولاً، لَلَزِمَ مِنهُ المَشَقَةُ وَ الضَرَرُ بِالنَاسْ، وَ لخَالَفَ قَواعِدْ الشَريعة المَبنيَّةِ عَلى التَخفِيف وَ اليُسْر وَ دَفْع الضَرَرَ والفَسَادْ، لِهذا نَرى مِشَايِخ المَذهَبْ خالَفوا مَانَص عَلَيهِ المجتَهِدُ في مَواضِع كَثِيرَة بِنَاهَا

[1] - الفروق ،ج١ص١٧٦.

عَلى مَا كَانَ فِي زَمَنِهِ ،لَعَلَمَهُمْ بأَنَّهُ لَوْ كَانَ فِي زَمَنِهِمْ لَقَالَ بِما قَالُوا بِهِ، أَخذاً مِنْ قَواعِدِ مَذْهَبِهِ)[1]، واتـه: زۆر لـه حوكمـه شـەرعییەكان بـه هـۆی جیـاوازیی ڕۆژگـارەوە دەگـۆڕێن، لـه سـۆنگەی گـۆڕانی عـورف‌و بـاوی خەڵكەكەیـەوە، یـان بـه هـۆی پەیدابوونی پێویستییەك، یـان تێكچوونی خـەڵكی ڕۆژگـارەوە، بـه جۆرێـك كـه ئەگەر ئەو حوكمـه هـەر لەسـەر حاڵـەتی یەكـەمی مابایـەوە، خەڵكەكـه تووشـی نـاڕەحەتیی‌و زیان دەبوون، هەروەها "مانەوەی ئـەو حوكمـه وەك خـۆی لەگـەڵ گۆڕانی عورف‌و باودا" پێچەوانەی بنچینەكانی شـەریعەتە كـه لەسـەر بناغـەی سوككردن‌و ئاسانكاریی‌و لابردنی زیان‌و خراپە، بنیات نراون.

بۆیـەش دەبیـنین زانایـانی مەزهـەب لـه زۆر شـوێنان پێچـەوانەی ئـەوەی موجتەهید دەقی لەسەر كردوە‌و، لەسەر بناغەی ئـەوە كـه لـه ڕۆژگـاری خۆیـدا هـەبووە بنیـاتی نـاوە، فـەتوایان داوە، چـونكە زانیویانـه كـه ئەگـەر ئـەو موجتەهیدەش لە ڕۆژگاری ئەوان دابوایە، هەمان قسەی ئەوانی دەكرد، بە پێی بنچینەكانی مەزهەبەكەی.

ئێسـتاش بـۆ چۆنیەتی جێبـەجێكردن (تطبیـق)ی ئـەو بنچینـه شـەرعییه بەسەر مەسەلەی جەژن‌و بۆنەی نەورۆزدا، دەڵێین:

ئەگـەر گریمـان هەڵوێـستی نـەرێنیی (سَلْبي) بەشـێك لـه زانایـان لـه بـارەی نەورۆزەوە، بە هۆی ئەوەوە بووبێ، كـه بـۆنی شـیرك‌و كوفریـان لێكـردوە، ئـەوە لەم ڕۆژگارەدا پێویستە ئەو حوكم‌و هەڵوێستە بگۆڕێ، چونكە:

ئێسـتا هـیچ كـەس نـه لـه نێـو گـەلی كوردسـتان‌و، نـه لـه نێـو هـیچ گـەلێكی

---

[1] – مجموعة الرسائل- نشرُ العُرف،ج٢، ص١٢٥.

دیکەشدا، بە هاندەرو بە هەوای کوفرو شیرکەوە یادی نەورۆز ناکەنەوە، بەڵکو عادەت و باوو هەلومەرجی خەڵکی یادکەرەوەی نەورۆز لەم ڕۆژگارەدا، بە تایبەت لە کوردستاندا، ئەوەیە کە نەورۆز بە یادو جەژنێکی نەتەوەیی و مێژوویی خۆیان دەزانن، یان بە ڕۆژی یەکەمی بەهارو سەرەتای ساڵی تازەی دادەنێن و، ئاگر کردنەوەکەشیان تەنیا ڕەمزو هێمایەکی ئەو بۆنەو یادەیەو، کەمو زۆر خەڵك بیر لە بە پیرۆز گرتن و بە گەورە گرتن و پەرستنی ئاگر، ناکاتەوە.

ئنجا مادام عورف و باوو هەلومەرجی خەڵکی ئەم ڕۆژگارە ئاوایە، کەواتە: یادکردنەوەکەش ئەگەر گریمان لە ڕابردووشدا گرێ و ئیشکالێکی تێدا بووبێ، ئێستا هیچ گرفت و ئیشکالێکی تێدا نیە، چونکە عورف و باوو هەلومەرجەکە لە حاڵەتێکی ناڕەوای کە بۆنی شیرك و کوفر لێهاتوە، گۆڕاوە بۆ حاڵەتێکی ڕەوا (مباح)، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد:

١- نەورۆز یان سەرەتای بەهارو دەستپێکی ساڵی تازەیەو، قوتاربوونی خەڵکە لە سەرماو سۆڵەو زوقمی زستان، کە بێگومان شادمانیی و دڵخۆشیی دەربڕین بەو بۆنەیەوە، شتێکی ئاسایی و ڕەوایەو، بەشەر حەزیان بە خۆشیی و ئاسانیی و ئاوو هەوای نە سارد نە گەرمی بەهارە.

٢- یان یادی دەرباز بوونی گەلی چەوساوەو خوێنمژراوی کوردە، لە چەنگ پادشا ئەژدەهاکی زۆردار، بە سەرمەشقێتی کاوەی ئاسنگەر، کە بێگومان دژی ستەمو چەوساندنەوە بوون و، لەگەڵ ستەملێکراوادا بوون، پەسند، بگرە پێویستەو، شتێکی ڕەواو پەسندە کە مسوڵمانان خۆشحاڵیی و شادمانیی دەربڕن، بە بۆنەی دەربازبوونی گەلێکی

ستەمدیدە لە زوڵم و زۆری حکومڕانێکی ستەمکارو خراپەکار، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای کاربەجێ نەفرینی لە ستەمکاران کردوەو فەرموویەتی: {أَلا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ}هود، ١٨، وە سەرزەنشتی مسوڵمانانێکی کردوە، کە ئامادە نەبوون لە پێناوی خواو قوتارکردنی چەوساوان دا بجەنگن و فەرموویەتی: {وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ}النساء، ٧٥، هەروەها خوای بەرزو مەزن ستایشی خۆی کردوە، بە بۆنەی ئەوەوە کە ستەمکارانی نابود کردوەو فەرموویەتی: {فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}الأنعام، ٤٥.

کەواتە: یادکردنەوەی ئەو ڕۆژە، کە گەلێکی چەوساوەی تێدا قوتار بووەو حوکمڕانێکی ملهوڕو خوێنمژی تێدا گرفتار بووە، لەگەڵ بەها بەرزەکانی ئیسلام و ئامانجە گەورەکانی شەریعەتدا کۆك و تەبایەو، هیچ گرفت و ئیشکالێکی تێدانیەو، گرنگ ئەوەیە شێوازی یادکردنەوەکەو، ئامانجەکەی ڕێك و ڕەوا بێ و، نا شەرعیی لەگەڵ تێکەڵ نەکرێ.

**پێنجەم: بۆنەی نەورۆزو ئاگر تێدا کردنەوەی، چ شادیی دەربڕین بێ، بە سەرەتای بەهارو نەمانی سەرماو زوقمی زستان، وە چ شادمانیی بێ، بە نەمانی ستەمکارێکی خوێنمژو دەرباز بوونی خەڵکێکی چەوساوە، شتێکی ڕەوایەو گرنگ ئەوەیە شێوازو ئامانج و نێوەڕۆکەکەی پێچەوانەی شەریعەت نەبێ.**

لە ڕاستییدا ئەم خاڵی پێنجەمە بریتیە لە ئەنجامگیریی (إستنتاج)ێك کە لە چوار خاڵی ڕابردوو دەگرێ و، بە پێویستی نازانم ئەوەی لە ڕابردوودا گوتراوەو، ئەنجامەکەی ئەوەیە کە لەم خاڵی پێنجەمەدا، (واتە:

ناوونیشانەکەیدا) خراوەتەڕوو، دووبارە بکەینەوەو بە کورتیی و پوختیی دەڵێم: مادام بناغە لە هەڵسوکەوتەکاندا ڕەوایی و ڕێپێدران بێ، مەگەر شتێك دەقێکی ڕوون و بێ چەندو چوونی شەریعەت قەدەغەی کردبێ و، ڕێی لێگرتبێ، وە جەژن و یادو بۆنەکانیش لە بازنەی هەڵسوکەوت و عادەتەکان دابن و، هیچ دەقێکی شەریعەتی ڕوون و ڕاشکاویش نەبێ لەسەر قەدەغەکران و ڕێ لێگیرانی یادو بۆنەکان بە گشتی.

پاشان هەر کام لە خۆشحاڵیی دەربڕین، بە بۆنەی کۆتایی هاتنی وەرزی زستان و بەسەرچوونی سەرماو سۆڵەو هاتنی وەرزی بەهار، وە شادمان بوون، بە ڕاپەڕینی گەلێکی چەوساوەو ستەمدیدە، بە ڕووی حکومڕانێکی ستەکارو خوێنمژداو، کۆتایی پێهێنانی ستەم و جەوری، لە خودی خۆیاندا دوو شتی ڕەواو سروشتیین و، لەگەڵ بنچینە شەرعییەکان و ئامانج و بەها بەرزەکانی شەریعەتدا تەباو کۆکن، بۆیە دەتوانین بە ڕاشکاویی بڵێین: یادو بۆنەی نەورۆز شتێکی ڕەواو ڕێ پێدراوەو، هیچ گرفت و ئیشکالێکی تێدا نیە، وە ئەگەر گریمان لە ڕابردووشدا هەندێك کەس گرفت و ئیشکالیان لەو ڕووەوە بووبێ، کە ئەو یادو بۆنەیە وێچوونی هەیە لەگەڵ هەندێك یادو دروشمی ئەهلی کوفرو شیرکدا "بۆ نموونە: مەجووسییەکان" ئەوە بێگومان لە نێو گەلێکی مسوڵمانی وەك کورددا، هیچ جێیەك بۆ ئەو گومان و گرفتە نیەو، هیچ کەسێکی مسوڵمان نەك هەر بە هاندەری بە بەرزو پیرۆز گرتنی ئاگر یادی نەورۆز ناکاتەوە، بگرە هەر بیریش لەوە ناکاتەوە، چونکە دەزانێ کە تەنیا خوا "عزو جل" (قُدُّوس)ە و، ئاگریش جگە لە دروستکراوێکی خوا چی دیکە نیە.

مەسەلەی بە پیرۆز گرتنی ئاگریش، پێموایە ڕەگ و ڕیشەکەی هەمان ئەو ڕەگ و ڕیشە فیکرییە ئەفسانەییەیە، کە بە درێژایی مێژووی بەشەرو لە کاتی

خەفەبوونی چرای وەحیو کزبوونی ڕووناکییو شۆقی پێغەمبەرایەتییدا، مرۆڤ پەنای بردۆتە بەر دیاردە سروشتییەکانو، بە خەیاڵی خۆی بۆ زیاتر بەهرە لێوەرگرتنیانو، سەلامەتو بێ بەلاّبوون لە زەرو زیانیان، هەڵساوە بە بەرزو پیرۆزگرتنیان، چونکە وایزانیوە کە هەرکامێکیان ڕووحێکی تایبەتی لە پشتەوەیە کە ئاڕاستەی دەکات!

ئاگریش وەچەرخانێکی گەورەی لە ژیانی بەشەردا دروست کردوە، کە مرۆڤ وێڕای خۆ پێ گەرمکردنەوەو گۆشتو خواردن پێ کولاّندنو برژاندن، بۆ دروستکردنی ئامێرو کەلو پەلو پاشان خشڵو ... هتدیش لێی بەهرەمەند بووە.

بۆیە بۆ کەسانێکی دوورکەوتووەوە لە وەحیو پێغەمبەرایەتیی، شتێکی ئاساییو چاوەڕوان کراو بووە، کە سەرەتا ڕێزی ئاگر بگرنو خۆشیان بوێو، پاشان زێدەڕۆیی لەو خۆشویستنو ڕێزلێگرتنەدا بکەنو، بیگەیەننە ئاستی بە بەرزو پیرۆز گرتنو پەرستن!

هەروەها بەنسبەت خۆرو ڕووناکییو گەلێك لە دیاردە سروشتییەکانی دیکەشەوە، بەهەمان شێوە.

بەلاّم پاش هۆشیار بوونەوەی مرۆڤ بە گشتی بە تایبەت بە نسبەت ئەو کۆمەلگاو گرووپانەی کە لە نێو مسوڵمانانددا دەژین، ڕێژەی بە پیرۆزگرانی ئاگر، زۆر کەم بۆتەوەو، ئێستاکە لە هەموو دنیادا ژمارەیان ناگاتە نیو ملیۆن[1].

---

[1] - موسوعة الأديان في العالم، الديانات القديمة،الزرادشتية، ص٢٦٧.

## پوختەی قسان لە بارەی نەورۆزەوە

١- یادکردنەوەی نەورۆزو بە جەژن گرتنی وەك سەری ساڵ، یان وەك بۆنەیەکی نەتەوەیی، لە بازنەی عادەت‌و هەڵسوکەوتەکاندایە، کە لە بنەڕەتدا ڕەواو ڕێپێدراون.

٢- بەڵام ڕەوابوونی نەورۆز وەك جەژن‌و بۆنەیەکی گشتی، یان نەتەوەیی، مانای ئەوە نیە کە هەرچۆنێکی بکرێ‌و هەرچیەکی تێدا بکرێ، هەر ڕەوایە، بەڵکو شتی حەڕام‌و ناڕەوا "بۆ وێنە: شایی ڕەشبەڵەك" لە نەورۆزو غەیری نەورۆزیشدا، هەر حەڕام‌و ناڕەوایە.

٣- ئەگەر گریمان کەسێك بە مەبەستی بە گەورەگرتن‌و بە پیرۆز گرتن (تعْظِیمِ وتقْدِیس)ی ئاگر، ئاگری ڕۆژی نەورۆز بکاتەوە، ئەوە ئەو ڕەفتارەی بە شیرك‌و کوفر دادەنرێ، بەڵام حوکمی یادکردنەوەی نەورۆز لە خودی خۆیدا، هەر ڕەوایە ناگۆڕێ.

٤- حوکمی یادکردنەوەی نەورۆز لە نێو گەلی کورددا، لەبەر ڕۆشنایی عادەت‌و باوو هەل‌و مەرجی ئێستای ئەو یادکردنەوەیەدا، دیاری دەکرێ‌و، ئەو حوکمەی کە هەندێك لە زانایان لەو بارەوە گوتوویانە: لە هەل‌و مەرج‌و عادەت‌و یادێکی دیکەی جیاوازدا، پابەندکەر(مُلْزِم)نیە بۆ خەڵکی دوای خۆیان، کە عادەت‌و هەل‌و مەرج‌و باوەکەیان گۆڕاوەو جیاوازە.

٥- بە جەژنگرتنی نەورۆزو یادکردنەوەی، لەگەڵ ئاگرکردنەوەدا، دوو شتی پێکەوە پەیوەست نین‌و، دەگونجێ یادی نەورۆز بکرێتەوە بەبێ ئاگرکردنەوە، وە لە ڕاستییدا ئەو سەرچاوانەی من بینیومن لەبارەی ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەرو نەورۆزەوە، هیچیان باسی ئاگرکردنەوەیان تێدا نەبووە، جگە لە نامیلکەکەی مامۆستا حەسەن مەحموود حەمە

کەریم، (کاوەو نەورۆز...) کە ئەویش بۆ ئاگر تێدا کردنەوەی نەورۆز تەنیا ئاماژە بە (ئەفسانەی ئەژدەهاك)ی (صابر گرد عازەبانی) دەکات.

٦- هەرچەندە ئاگرکردنەوە لە خودی خۆیدا شتێکی ڕەوایە، بەڵام پێویستە ئاگرکردنەوەکە بە شێوەیەك نەبێ کە ببێتە مایەی پیس بوونی ژینگە، کە لەم ڕۆژگارەدا گرفتو کێشەیەکی گەورەی دنیایە.

دیارە ئەویش بەوە دەبێ کە ئاگرێکی بە داروتەختە لەسەر لوتکەی چیایەکی بەرز بکرێتەوە، نەك لە هەموو جادەو کۆڵانێك نەوتو قیرو کۆنە تایەو لاستیك بسووتێنرێ.

٧- وەك ساغمان کردەوە، ڕیشەی یادی نەورۆز، یان گۆڕانکاریی کەش و هەوای ساڵەو کۆتایی هاتنی زستان و هاتنی بەهارە، یان ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەرو ئەژدەهاکە!

بۆیە وەك چۆن بە شتێکی هەڵەی دەزانم بە ناوی ئیسلام و شەریعەتەوە دژایەتیی نەورۆز بکرێ، کە زۆربەی خەڵك وەك هێماو دروشمێکی نەتەوەیی تەماشای دەکەن "بنەڕەتەکەی هەرچییەك بێ"، بە هەمان شێوەش بە هەڵەی دەزانم لە بەرانبەریشدا نەورۆزو ئاگر تێدا کردنەوەکەی، زێدەڕۆیی تێدا بکرێو، بکرێتە تەرازوو و سەنگی مەحەکی کوردایەتیی و نەتەوە پەروەریی، چونکە ڕەوا نیە بەسەرهاتێکی ئەفسانەیی، یان گۆڕانکارییەکی کەش و هەوای ساڵانە، بکرێتە بناغەو پێوەری نیشتیمان پەروەریی و کوردایەتیی!

کەواتە:

با ئەوانەی بە ناوی پابەندیی بە شەریعەتەوە دژایەتی نەورۆز دەکەن، بزانن کە هیچ دەقێکی ڕاست و ڕوونی شەریعەت پشتگیریی هەڵوێستەکەیان ناکات و، با لە خۆیانەوە بازنەی قەدەغە کراوەکان لەسەر حیسابی ڕەواو حەڵاڵ

فـراوان نەکـەن و، بـە هەڵـە خـەڵکێکی زۆر وا حـاڵی نەکـەن، کـە ئیسلام دژی قــەوارەی سیاســیی و مــاف نەتەوایــەتیی گەلەکــەیان و، مێــژوو و کلتــوورو دروشمەکانیەتی!

هــەروەها لــە بەرانبەریشــدا بــا ئەوانــەی بــە نــاوی کوردایــەتیی و نەتەوەپـەروەریی و نیشـتیمان پەروەرییـەوە، زۆر داکۆکیی لـە نـەورۆز دەکـەن، بـزانن کـە نـەورۆز بناغەیـەکی هێنـدە پتـەوی نیـەو، ناگونجێ کوردایـەتیی و نەتـەوە پـەروەریی تێـدا کـورت بکرێتـەوەو، بکرێتـە سـەنگی مەحـەکی دڵسۆز بـوون بـۆ گـەل و نیشـتیمان و جیاکـەرەوەی: بـە تـەنگ نەتـەوەو نیشـتیمانەوە بووان و، گوێ پێنەدەرانی گەل و نیشتیمان!

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

٩ محرم/ ١٤٣٤ ك

٢٣ تشرینی دووەم/ ٢٠١٢ ز

هەولێر

ناوەرۆك